# دەرمان و مادەهۆشبەرەکان
# هۆکارەکانی ئالودەگی و شێوازەکانی خۆپاراستن و بەرەنگاربوونەوەیان

# Drugs and Intoxicant Substances
# Reasons behind Addiction and methods of protection and Challenge

نوسینی: عەتای مەلاکەریم

پرۆژەی کتێبی زانستی
2008

سەرپەرشتیاری گشتی زنجیرەی کتێبی زانستی

## ئەکرەم قەرەداخی


- ✓ ناوی کتێب:دەرمان و مادەهۆشبەرەکان
- ✓ نوسەر: عەتای مەلاکەریم
- ✓ مۆنتاژ: ئەسرین ئەسکەندەری
- ✓ پرۆژەی کتێبی زانستی: 1
- ✓ چاپ: یەکەم
- ✓ ساڵی چاپ: 2008
- ✓ تیراژ: 1000
- ✓ ژمارەی سپاردن: 655
- ✓ چاپخانە: چاپخانەی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم
- ✓ نرخی 2000 دینار

ئەم کتێبە پێشکەشە

بە هەرسێ کوڕەکەم ژیارو ژینیارو ڕێنوار

بەهیوای پاشەڕۆژێکی پرشنگدار

بۆ هەموو منالآنی کوردستان

# ناوەڕۆك

## پێشەکی

لە منداڵییەوە وشەی وەك قات و تلیاك بەرگوێمان دەکەوت. کە شتێك کەم بوایە یان لە بازاڕدا نەبوایە پێیان دەووت بووە بە تلیاك! چەندەها جار گوێم لە دایکم بووە ووتویەتی: ئەو شتە قاتی بووە، دەست ناکەوێت. باشە قات و قاتی چی دەگەیەنێت؟ نە دایکم و نە من ئەو سەردەمە نەماندەزانی قات چییە، بەڵام دەمانزانی شتێکی دانسقەو گرانبەهاو دەگمەن دەگەیەنێت. کاتێك شاکاری "لانەوازان" کەوتە بەرچاو لەوێدا وەستا سابیر گیرۆدەی تلیاك بوو بوو، هادی قاچاخچیش دابەشکەرو دابینکەری ئەو مادەیە بوو. باشە ئەو پیاوە بۆ خۆی خستۆتە ئەو بارە ناهەموارەوە؟

بەدرێژایی مێژووی نوێی شانۆو نواندنی کوردی گەلێك نمونەی دیکەش دەبینین کە کەسانێك شرووبی تۆسیرام بەیەك قوم هەڵدەقوڕێنن و ناچارن بۆ پەیداکردنی پەناببەنە بەر کاری خراپ و لەلایەن پۆلیسەوە دەستگیر دەکرێن

دیاره لێرەدا بواری باسکردن و شیکارکردنیان نییە. دەڵێن هونەر ئاوێنەی کۆمەڵگایە کەواتە گەر دیاردەیەك لە کۆمەڵگادا بوونی نەبێت لە هونەریشدا جێگای نابێتەوە.

جاروباریش لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا ئاماژە بە کێشەی ئالودەگی بە دەرمان و مادە هۆشبەرەکانەوە کراوە، بەڵام ئەوەندەی من ئاگادارم باسێکی تێرو تەسەل و هەمەلایەنە لەو بارەیەوە نەکراوە ، بێجگە لە چەند وتارێکی کورت و چەند نامیلکەیەکی بچوك دەربارەی زیانەکانی جگەرەو ئەلکهول نەبێت کە زیاتر بەمەبەستی هۆشیارکردنەوەی تەندروستی نوسراون.

باسکردنی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان مەسەلەیەك نییە ئێمە ئێستا دایبهێنین بەڵکو باسکردنی کێشەیەکە کە خۆی لە خۆیدا هەیەو بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتیش، بە پلەی لێکجیاواز، هەبووەو کێشەی هەموو جیهانیشە کە کوردستانیش بەشێکی دانەبڕاوە لێی.

لەوانەیە کەسانێك بڵێن نەخێر: وڵاتی ئێمە شوکور ئەو کێشانەی نییەو باسکردنیشیان ڕەنگە ببێت بە پروپاگەندەو ڕیکلام بۆ گەنجان! تکایە واز لەو مەسەلەیە بهێنن. بەڵام واقیعی ژیانی ڕۆژانەی گەنجەکانمان و پەردەوازە بوونی هەزارانیان بە هەرچوارقوژبنی جیهانداو گەڕانەوەی چەندەهایشیان بۆ هەرێمی کوردستان کە بێگومان بەدەر نییە لە هێنانەوەی دیاردەو خوو هەڵسوکەوتی باش و خراپ و هەمەجۆر پێچەوانەی ئەو مەسەلەیە دەسەلمێنێت. سەرباری ئەوەش کە ئێستا جیهان بووە بە گوندێکی بچوك و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن لە تەلەفیزیۆن و سەتەلایت و ئینتەرنێت و مۆبایل هەموو جیهانی لە چوارچێوەی یەك تۆڕی پێکەوەگرێدراودا تەنیوە.

پێش بەجێهێشتنی کوردستان لە ساڵی 2002 دا گەلێك جار گوێم لە وشەی حەبخۆرو حەبخۆرەکان و مودمین و موعتاد و شوروبخۆر دەبوو کە بۆ خەڵکانێك بەکاردەهات و ئەوەش کە نکولی لێناکرێت مێژووی دوورودرێژی جگەرەو ئەلکهولە لە کوردستاندا کە خەڵکانێکی زۆر بە ڕێژەیەکی کەم تازۆر بەکاریان دەهێنن.

دیارە کوردستان بە بەرانبەرکردن لەگەڵ ئێران و ئەفغانستان و خۆرئاوا کێشەی دەرمان و مادە هۆشبەرەکانی زۆر کەمەو ئەمەش مایەی خۆشبەختییەو زوو فریاکەوتنی ئەو مەسەلەیەش بواری بەرگرتن و خۆپاراستن باشتر دەڕەخسێنێت. نەخۆشێك کە تازە گیرۆدەی دەردێك بووە زۆر ئاسانتر چارەسەر دەکرێت لە کەسێکی دیکە کە چەندەها ساڵە بەو دەردەوە دەناڵێنێت.

بەگەیشتنم بۆ هەندەران هێندەی نەبرد کە لەلایەن کەسێکی نەناسراوەوە تەلەفونێکم بۆکرا. ئەو بەم جۆرە دوا: ژمارە تەلەفونی تۆیان داوە بەمن کە گوایە تۆ کەسێکی پەنابەریت و شارەزای زمانی ئینگلیزیت و ... هتد منیش ڕەزامەندیم بۆ دیدارەکە نیشاندا بەبێ ئەوەی کە بزانم چییەو بەچی دەکات.

ئەو کەسە (ئاندی پرات) لێپرسراوی تیمی بەرگری لە دەرمان و مادە هۆشبەرەکانی شارەکەم بوو. کاتێك دەربارەی دەرمان پرسیاری لێکردم ئەو مەسەلەیەم زۆر لەلا نامۆ بوو. ڕاست و ڕەوان ووتم من دەربارەی ئەو مەسەلەیە هیچ نازانم و ئەسڵەن لە وڵاتی ئێمەدا کێشەی لەو جۆرە نییە. ئەو زۆر بەهێمنی ووتی ئێمە هیچ کارمان بە گرتن و بردن و ڕلوەدونانی ئەو کەسانە نییە کە پەیوەندیان بە کێشەی دەرمانەوە هەیە، ئەوە ئەرکی

پۆلیسە. ئەرکی ئێمە پەروەردەو هوشیارکردنەوەیەو بەشێوەیەکی دەوری کۆدەبینەوەو نوێنەرانی هەموو بەشەکانی کۆمەڵگامان لەگەڵەو ئەگەر پێت خۆش بێت تۆیش دەتوانیت لەگەڵمان بەشداربیت. کورد دەڵێت شەڕ لە بەتاڵی باشترە! منیش ڕەزامەندیم نیشاندا.

دوای ئەوە بەشداری کۆبونەوەکانم کردو زانیاری باشم دەستگیر بوو دەربارەی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان. ماوەیەك لەوەدوا لەڕێگای ئەوانەوە بەشداری کۆنفرانسی یەك ڕۆژەی مانچستەرم کرد دەربارەی شێوازەکانی بەرگرتن لە ئالودەگی بەدەرمان و مادە هۆشبەرەکانەوەو هەر لەوڕێگایەشەوە بەشداری کۆنفرانسی یەك ڕۆژەی لەندەنم کرد کە زیاتر لە 1000 کەس تێیدا بەشدار بوون بە نوێنەرلیەتی سەرجەم نەتەوەو ئاین و ڕەگەزەکانی نێو بەریتانیا لە مانگی ئایاری 2003 داو لەوێ چاوم بەکەسانێکی زۆر کەوت و نمونەی چەندەها دەرمانم بەچاوی خۆم بینی کە بۆ نمایش دانرابوون، یەکێك لەوانە قات بوو!

لەلایەکەوە بەهۆی کاریگەری تیمی بەرگری لە دەرمان و مادەهۆشبەرەکانەوەو لەلایەکی تریشەوە بەهۆی بابەتی خوێندنەکەمەوە کە تایبەتە بە کریمینۆلۆجی واتە تاوانناسی، خولیای قوڵبونەوەی زیاتر لەو مەسەلەیەدا لەلام چەکەرەی کرد و کۆرسێکی تایبەتم وەرگرت بەناوی " هوشیاربوونەوە لە مەترسییەکانی دەرمان و پراکتیزەکردنیان" و لە ئەنجامدا بڕوانامەی NCFE in Drug Awareness Studies and Their Applications وەرگرت و مەسەلەی نامیلکەیەکی کوردیم لەگەڵ لێپرسراوی کۆرسەکە (پیتەر بروکس) باسکرد. ئەو یەکەمجار زۆر زۆری

پێخۆش بوو و ووتی کە پرۆژەیەکی لەوبابەتە بەدەستەوەیە بۆ وەرگێڕانی ئەو کۆرسە بۆ گەلێك زمان ئەگەر تۆیش کوردی بهێنیتە نێو ئەو پرۆژەیەوە ئەوە مایەی خۆشحاڵی ئێمەیە.دوای ئەوە بە ماوەیەك پێی ڕاگەیاندم کە بەداخەوە کۆلێج ڕازی نەبون کە ئەو کۆرسە وەربگێڕدرێت بۆ زمانی ئۆردوو گوجاراتی چونکە خەڵکی پاکستان و هیندستان لێرە گەنجەکانیان هەموو ئینگلیزی دەزانن و وەرگێڕانی بۆ ئەو زمانانە پێویست ناکات. هەرچی کوردیشە دەمێنێتەوە سەر خۆت بەڵام کۆلێج ئامادە نییە هیچ کۆمەکێکت بکات.

ئەو مەسەلەیە بەو جۆرە مایەوە تا پەیوەندیم کرد بە کاك ئەکرەم قەرەداخییەوە لە سلێمانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (لە ڕێگای ئومێدی برازامەوە) کاك ئەکرەم زۆر بە ڕێزەوە پێشوازی لەو مەسەلەیە کردو من لێرەدا بەپێویستی دەزانم کە سوپاسی ئەو هاندانەی بکەم چونکە بەبێ ئەو هاندانەی ئەو باوەڕناکەم دەستم بچوایە ئەو کارەو ئەم خزمەتە بچوکەم پێشکەش بە گەلەکەم بکردایە.

دوای بەرانبەر کردنی دەیان کتێب و نامیلکەو چەندەها ماڵپەڕی ئینتەرنێت و پەیوەندی ئەلەکترۆنی E-mail بە چەندەها لایەنی بەرگریکردن لە دەرمان و مادە هۆشبەرەکانەوە لە بەریتانیاو ئەورووپاو ئەمریکا، گەیشتمە ئەو ڕاستییەی کە ئەوان دوای ئەزمونی چەندەها ساڵە گەیشتونەتە ئەو ئاستەی کە ئێستا تێیدان و وەرگێڕانی ئەو کۆرسە یان هەرکتێبێکی دیکە کە لە بەریتانیا یان خۆرئاوا نوسراوە بە تەنهاو وەکو خۆی بۆ کوردیی ناتوانێت وەلامدەرەوە بێت بە کێشەی خوێنەری کورد. کتێب و نوسراوەکانی ئەوان

هەریەکەیان لایەنێکی مەسەلەکە شیکاردەکات و ناکرێت هەمویشیان وا بە زوویی وەربگێڕدرێن.

لەئەنجامدا گەیشتمە ئەو ڕاستییەی کە بە کەڵك وەرگرتن لەهەموو ئەو سەرچاوەو خەزنە پڕ زانیاریانە خۆم نامیلکەیەك ئامادەبکەم کە هەتا بکرێت گشتگیرو هەمەلایەنە بێت و لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگای کوردەواریدا کۆك بێت و وەڵامدەرەوەبێت بە پرسیارو گرێکانی نێو هزری گەنجانی کوردستان.

**هیوادارم ئەم هەوڵە بچوکەی من ببێتە هەنگاوێك لەو ڕێگا دوورو درێژو سەختەداو بتوانێت بەردێك بێت لە دیواری پۆڵاینی بەرگری تەندروستی گەنجەکانماندا تا ئەوکاتەی کە بەتەواوی بەرنامەیەکی ستراتیژی فراوان دادەڕێژرێت بۆ بەگژاچوونەوەی دیاردە و دەردە کۆمەڵایەتییە کۆن و نوێکان.**

**عەتای مەلاکەریم**

**بەریتانیا**

# دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان ـ لە کۆنەوە تا ئەمرۆ

دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان چین؟

کاریگەری دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان لەسەر مرۆڤ چیە؟

بۆچی خەڵك دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان بەکاردەهێنن؟

مێژووی بەکارهێنانی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان

یاسای نێو دەوڵەتی‌و دەوڵەتان لەمەڕ دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان؟

## دەرمانو مادە هۆشبەرەکان چین؟

وشەی دەرمان لەبنەڕەتدا بۆ هەموو ئەو مادەو پێکهاتە کیمیاویانە بەکارهاتووە کە بە شێوەیەك یان زیاتر کاریگەری بایۆلۆژیو سایکۆلۆژی جێدەهێڵن لەسەر لەشێکی زیندوو کاتێك بەشێوەیەك لە شێوەکان دەچنە نێو ئەو لەشەوە. بەگوێرەی ئەم پێناسەیە دەرمان هەموو ئەو مادانە دەگرێتەوە کە بەدرێژایی مێژوو مرۆڤ بۆ کەمکردنەوەی ئازارو چارەسەری دەردەکانی، یان بۆ لەناو بردنی نەیارەکانی (ژەهر) بەکاری هێناون" جا ئیتر لە کۆمەڵێك گژوگیای کوتراو دروستی کردبن یاخود لە تاقیگەیەکی کیمیاوی مۆدێرندا ئامادەکرابن.

دەرمان Drug یان Drugs لە زمانی ئینگلیزیو کۆمەڵگای هاوچەرخی ئینگلیزیدا ئەمڕۆ یەکسەر و بێ چەندوچون ئەو مادانە دەگرێتەوە کە دەبنە هۆی گۆڕینی شێوازی ئاسایی کارکردنی مێشكو لەش یان هەردوکیان پێکەوە[1] بەم جۆرە هەرجۆرە باسکردنێکی دەرمان واتای ئەو دەرمانانە دەگەیەنێت کە بەکارهێنانیان بەشێوەیەك یان زیاتر کار لە شێوەی کارکردنی ئاسایی لەشو مێشك دەکات، ئیتر بەکارهێنانیان یاسایی بێت وەك ئەلکهولو جگەرە یان نایاسایی بێت وەك هەموو دەرمانو مادە هۆشبەرەکانی دیکە. ئەگەرچی زۆر کەس وشەی دەرمانە نایاساییەکان Illegal Drugs بەکاردەهێنێت بەڵام بەشێوەیەکی گشتی وشەی Drug ئەو واتایە دەدات بەدەستەوە. لەزمانی کوردیدا وشەی دەرمان بە تەنها زیاتر مانا

---

[1] Drug Awareness Studies and their Applications (NCFE Course) UK 2003.

پزیشکییەکەی دەگەیەنێت واتە ئەو مادانەی کە حەکیمو دوکتۆر بۆ چارەسەری نەخۆش ئامادەی دەکەن یان بەکاریدەهێنن، بەڵام دەستەواژەی "دەرمانو مادە هۆشبەرەکان" پڕاوپڕ مانای Drugs دەبەخشێت بەپێی مانا ئینگلیزییەکەی. پێدەچێت لە پاشەڕۆژدا ئەم ناوە کورتببێتەوەو تەنها وشەی دەرمان مەبەستەکە بدات بەدەستەوە، بەڵام بۆ مەبەستی ئەم کتێبە دەستەواژەی دەرمانو مادە هۆشبەرەکان بەکاردەهێنم بۆ دوورکەوتنەوە لە لێڵیو تەمومژ.

دەرمانو مادەهۆشبەرەکان ، دەکرێت بوترێت، لە چاو قاوەوە دەست پێدەکەنو بە ئەلکهولو جگەرەدا تێدەپەڕن تا دەگەنە هێرۆینو ئەفیونو کراك کۆکاینو هتد... بەم شێوەیە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە دەرمانو مادە هۆشبەرەکان بۆمبێکی شاراوە نینو خویەکی تایبەت بە دەستەیەکی تایبەتی کۆمەڵگا نین بەڵکو بە شێوەیەك یان زیاتر سەردەکەن بە هەموو ماڵێکداو هیچ کۆمەڵگایەك لێیان بەدەر نییە، پێشکەوتو بێت یان دواکەوتو.

بێگومان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە بوترێت: کەوابێت دەرمانو مادە هۆشبەرەکان زۆر ئاساییینو بەشێکن لە ژیانی ڕۆژانەمان یاخود وا تێبگەین کە هەموویان وەك یەکن. بەڵکو بە پێچەوانەوە جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوانیانداو، وەك دواتر ڕوونی دەکەمەوە، دابەش دەبن بەسەر چەندەها گروپو پلەی مەترسی جیاجیادا.

# کاریگەری دەرمان و مادەهۆشبەرەکان لەسەر مرۆڤ چییە؟

دەرمان و مادە هۆشبەرەکان بەپلەی یەکەم دەبنە هۆی ئەوەی مرۆڤ خویان پێوەبگرێت و نەتوانێت بە ئاسانی دەستبەرداریان ببێت. ئەمەش چەندەها کێشەی ئابوری و کۆمەڵایەتی و تەندروستی بەدوادا دێت و لە سەریەشەو بێتاقەتیەکی بچوکەوە بیگرە تا دەگاتە دزی و ئەنجامدانی تاوان و لە هەندێك باریشدا پەککەوتەیی و تەنانەت مردنی ئەو کەسەش لەئەنجامی زیادە بەکارهێنانەوە یان توشبونیەوە بە چەندەها نەخۆشیی کوژەری وەك شێرپەنجەو نەخۆشییەکانی دڵ و مێشك. ئەو کەسانەی کە جۆرێك یان چەند جۆرێك لە دەرمان و مادە هۆشبەرەکان بەکاردەهێنن لەسەری ڕادێن و بەردەوام حەز بەبەکارهێنانی زیاتری ئەو مادانە دەکەن بۆ ئەوەی هەست بکەن ئاسایین. ئەم دیاردەیە لە پلە سەرەتاییەکانیدا پێیدەڵێن خوگرتن یان خوگری و تاڕادەیەك بە ئاسایی دادەنرێت. خوگری دەکرێت بە چالاکی و هەڵسوکەوتی دیکەشەوە بێت وەك قومار، دۆمینە،

تاوڵە، گوێگرتن لە هەواڵ و کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و یارییە ئەلەکترۆنییەکان، یان بە خواردنی جۆرە خواردنێکی تایبەتەوە وەك گوڵەبەڕۆژەو چەرەس و زۆرخۆری.

کاتێك خوگری گەیشتە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە ئەو کەسە بەبێ ئەو دەرمانە یان مادەیە هەڵنەکات و لە کاتی لێبڕان یان لێکشانەوەیدا بەتەواوی باری ژیانی تێکچوو هەستی بە بارێکی ناهەموارکردو دەرمان و مادە هۆشبەرەکە بووە

کێشەی سەرەکیو مەبەستی بنچینەیی ژیانی، ئەوا پێدەنێتە قۆناغێکی نوێوە کە بە ئینگلیزی پێی دەڵێن Addictedو بە عەرەبی پێیدەڵێن "مدمن"و بە فارسی پێیدەڵێن "موعتاد" بەکوردیش من وشەی "ئالودەگی"م بۆ داناوە. ئالودەگی واتە ئەو کەسە بەجۆرێك ئالودەی ئەو شتە بووە کە وازهێنانی سەختە، بەڵام نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت کە ئەستەم نییە. زۆر کەس بەسەرکەوتویی واز لەو مادانە دەهێنن، ئەگەرچی زۆر کەسی دیکەش تێهەڵدەچنەوە. کەسانێك کە ساڵەهایە وازیان لە هیرۆین هێناوە، ڕەنگە هێشتا کاریگەرییەکەی هەر لە بەشی پشتەوەی هەستەکانیاندا خۆی مەڵاس دابێتو چاوەڕوانی ئەهامەتیو کۆستێکی ئەو کەسە بن کە بەرەو لایان هەڵبخلیسکێتەوە.[2] ئەو کەسەی کە دەست لە دەرمانو مادە هۆشبەرەکان هەڵدەگرێتو لەپڕ لێیان دەکشێتەوە هەست بە بارێکی دەرونیو جەستەیی ناخۆش دەکات کە پێی دەڵێن پاشەکشێ یان کشانەوە Withdrawal ئەمەشبەپێی جۆری دەرمانەکەو ڕادەی ئالودەگی کەسەکەو کەسایەتییەکەی دەگۆڕێت. ئەم بارە ئێستا لەڕێگای کۆمەکی پزیشکییەوە چارەسەردەکرێت. لەکۆمەڵگای کوردەواری خۆماندا چەندەها کەس بەبێ هیچ جۆرە کۆمەكو چارەسەرێکی پزیشکی وازیان لە جگەرە کێشان هێناوە، کە دیارە نیکۆتین یەکێکە لە مادە ئالودەگییە هەرە بەهێزەکان، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئیرادەی پۆلاینی تاکەکەس کە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە .ئەوکەسەی کە دەرمانو مادە هۆشبەرەکان بەکاردەهێنێت هەمیشە

---

[2] Claire, A.,& Smith, H., (2003) Drug Culture: The Facts Behind the Headlines. London: Franklin Watts p.6.

لەشی داوای زیاتری لێدەکات بۆ ئەوەی هەست بکات ئاساییە. واتە لەشی ئەو کەسە ڕۆژ بە ڕۆژ لەگەڵ ئەو دەرمانە ڕادێت‌و بۆئەوەی ئەو کاریگەرییەی جارانی هەبێت پێویستی بە ڕادەیەکی زیاترە لەو مادەیە. ئەمەش جارێکی دیکە بەپێی جۆری دەرمانەکەو ڕادەی زۆرو کەم بەکارهێنانی دەگۆڕێت لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە. ئەم بارە پێی دەڵێن ڕاهاتن یان قبوڵکردن Tolerance. پێدەچێت کەسێك بڵێت: باشە باپیرم 70 ساڵە جگەرە دەکێشێت‌و هیچیشی لێنەهاتووە! یان فلانە کەس ئەوەتەی هەیە ئەلکهول دەخواتەوەو تەندروستیشی زۆر باشە! ئەمانە زۆر جار ڕاستن‌و هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی نێوان تەندروستی کەسەکان، هۆکاری دەوروبەرو شێوازی قبوڵکردنی لەشی ئەو کەسە بۆ ئەو مادەیەو ڕاهاتنی لەسەری‌و هەروەها شێوازی بەکارهێنانی مادەکە" تا چ ڕادەیەك کۆنترۆڵی هەبووە بەسەر خۆیداو مادەکە کۆنترۆڵی نەکردووە بەسەریدا. بەڵام نابێت ئەو ڕاستییەمان لەبیر بچێت کە یەك بەیەکی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زانستی‌و کۆکردنەوەی زانیاری‌و ئامارو داتاوە پلەی مەترسییان بۆ دانراوەو ئامۆژگاری خەڵك کراوە کە بەکاریان نەهێنن یان بەپێی یاسا قەدەغەکراون. ئەم لێکۆڵینەوەو توێژینەوە زانستییانە هەردەم بەردەوامن‌و ڕۆژانە ئەنجامی نوێ دەدەن بەدەستەوە. نوێترین دەرەنجام لەسەر زیانەکانی ئەلکهول‌و جگەرەیە کە لە هەموو جیهان‌و بەتایبەتی لە خۆرئاوا بە زۆری بەکاردێن‌و بەشێکن لەژیانی ڕۆژانەی ملیۆنان کەس.

بەکارهێنانی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان دەبێتە هۆی گەلێك کێشەو تەنگوچەڵەمەی کەسێتی‌و خێزانی‌و کۆمەڵایەتی کە کاریگەری ئەدگاری‌و

تەندروستی‌و ئابوری گەورەی لێدەکەوێتەوە.

لێکۆڵینەوەکان لەسەر هەڵسوکەوتی بەکارهێنەران لە بەریتانیا تێبینی ئەم خاڵانەیان کردووە:

- ❖ **شەڕەنگێزی:** بەکارهێنەران بەزۆری توندوتیژو شەڕەنگێزن‌و بە ڕێژەیەکی بەرز لە کاری توندوتیژی‌و تاوانەوە دەگلێن.
- ❖ **ئاژاوەی ناوماڵ:** بەکارهێنەران ڕێژەیەکی بەرزی ئاژاوەی ناوماڵیان هەیەو ڕێژەی تەلاق‌و دەستلێکبەردان لەنێوانیاندا زۆر بەرزە.
- ❖ **تێچونی تەندروستی:** بەکارهێنەران کۆڵێکی قورسن بەسەر خێزان‌و کۆمەڵگاوە بەهۆی تێچونی کێشە تەندروستییەکانیانەوە کە بەهۆی دەرمانەوە لە ئاستێکی بەرزدایە.
- ❖ **کارنەکردن:** ڕێژەی بێکاران لەنێو بەکارهێنەراندا زۆر بەرزەو کەمتر هەلی کارکردنیان بۆ هەڵدەکەوێت بەهۆی نەگونجانی.
- ❖ مەرجەکانی کارو ڕەفتارو هەڵسوکەوت‌و شێوازی ژیانی ئالودەبوانەوە.
- ❖ **تێچونە ماڵییەکان:** بەکارهێنەران هەردەم بارێکی قورسی ماڵین بەسەر خۆیان‌و خێزانەکانیان‌و کۆمەڵگاو دەوڵەتەوە.
- ❖ **تاوانی زیاتر:** بەکارهێنانی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان واتا تاوانی زیاتر.
- ❖ **منداڵ:** بەکارهێنەران ناتوانن بەباشی منداڵەکانیان پەروەردە بکەن‌و زۆربەی جار خراپ مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەن‌و لەئەنجامدا وەك نمونەی خراپ دێنە نێو کۆمەڵگاو بەزۆریی ئەوانیش ئالودە دەبن.

❖ **قەرەباڵغبوونی گرتوخانەکان:** بەکارهێنەران ڕێژەیەکی بەرزی زیندانییەکان پێکدەهێنن.[3]

بەکارهێنەرانی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان زۆر شێوەو شێوازیان هەیە کە لەگەڵ شێوازی خەڵکی ئاساییدا جیاوازە، ئەمەش وا لە زۆر کەس دەکات کە فەرمانی ئەوە بدەن کە هەموو ئەوکەسانە بە ئاسانی جیادەکەنەوە. لە ڕاستیدا ئەگەر بەو جۆرە بیر بکەینەوە ڕەنگە بکەوینە هەڵەی گەورەوە.

نیشانەی جەستەیی و ئەنگاری زۆر جار بەڵگەیە بەڵام زۆرجاری دیکەش فریودەرن، چەندەها کێشەی ئابوری و تەندروستی و سایکۆلۆژی و کولتوری کار لە مرۆڤەکان و چونێتی هەڵسوکەوت و گرنگیدان یان نەدانیان دەکات بە جلوبەرگ و شێوازی دەرەوەو ڕادەی گرنگیدان یان نەدانیان بە سیمای خۆیان. لەبەر ئەو هۆیانە دەبێت زۆر وریا بین لە بڕیاردانماندا بەسەر خەڵکیدا و هەڵەشە نەبین. بەشێوەیەکی گشتی ئەم نیشانەو سیما دەرەکی و هەڵسوکەوتییانە لە بەکارهێنەراندا ڕەچاوکراوە:

❖ مەزاجیان بەزۆری بەرزو نزم و هەڵبەزو دابەز دەکات و لەوپەڕی خۆشی و شادییەوە دەفڕێت بۆ ئەوپەڕی پەستی و بێتاقەتی و بەپێچەوانەشەوە.

❖ بەزۆری لە چونە سەرکارو خوێندنگاو زانکۆو هتد... دوادەکەون.

❖ ڕێژەی بزربوونیان لە کار یان خوێندن هتد... بەرزە.

❖ بەشێوەیەکی بەردەوام پارە قەرز دەکەن.

❖ منداڵ و گەنجان پێدەچێت پارە لە دایک و باوک و کەس و کارو هاوڕێکانیان بدزن.

❖ بەزۆری ئارەزوی خواردنیان کەمە و کێشیان دادەبەزێت.

---

[3] Drug Awareness Studies and their Applications (NCFE Course) UK 2003.

❖ مێشکیان جەنجاڵەو ناتوانن چەقببەستنە (ترکیز) سەر خاڵێکی دیاریکراو.

❖ شێوەی جلوبەرگیان ناقۆلاو پیسوپۆخڵو نەگونجاوە لەگەڵ ئارەزوی گشتی.

❖ بەزۆری پیاوان سەروڕیشیان هاتووەو گرنگی نادەن بە شێوەی دەرەکییان.

❖ کاتێکی زۆر لەدەرەوەی ماڵ بەسەردەبەن.

❖ ماوەی زۆر دەخەون، بەتایبەتی دوای بەسەربردنی ماوەیەکی زۆر لەدەرەوەی ماڵ.

❖ چەقۆو کەوچکو شتی لەوبابەتانەیان لەلایە کە ڕەنگیان گۆڕاوە پێدەچێت بۆ مەبەستی دەرمان بەکارهاتبن.

❖ پێدەچێت سرنجو دەرزی بۆ ئەو مەبەستە بەکاربێن.

بەلام هەروەك پێشتر باسم کرد، ئەم نیشانانە مەرجی سەرەکی نینو نەبونیشیان جارێکی دیکە مەرجی خاوێنی ناگەیەنێت لە بەکارهێنانی ئەو مادانە. چونکە کەسانێك کە باری مادییان یان پلەو پایەی سیاسیو کۆمەلایەتیان یان هەموویان پێکەوە چەندەها نەنگیو ڕەفتاری خراپیان بۆ حەشاردەدات دەتوانێت لە نیشانە دەرەکییەکانی بەکارهێنانی ئەم مادانەش بیانپارێزێت بەلام دیارە لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنانو بەردەوامییەوە ناتوانن خۆیان لە ئاسەوارە تەندروستیو کۆمەلایەتییەکانی بپارێزنو هەر دەردەکەون.

# بۆچــی خــەڵك دەرمــان و مادەهۆشــبەرەکان بەکاردەهێنن؟

"وا خــەمڵێنراوە کــە 3٪ ی دانیــشتوانی گــۆی زەوی، یــان 185 ملیــۆن کــەس دەرمــان و مــادە هۆشــبەرەکان ســاڵانە بــەکاردەهێنن. لــەنێو ئەوانــەدا خەڵکی نزیکەی هەموو وڵاتەکانی جیهان و هــەموو بوارەکــانی ژیــانی تێدایــە . ژمارەیــەکی دیکــەی لەهەژمارنــەهاتوویش، لەسەرتاســەری جیهانــدا ســەرقاڵی بەرهەمهێنان و قاچاخچێتین بە دەرمان و مــادە هۆشــبەرەکانەوەو کەســانێکی زیــاتریش بەدەســت کێــشە کۆمەڵایــەتی و ئاســەوارە ئابوورییــەکانی ئــەم بازرگانییەوە دەناڵێنن. ئەم خەڵکە لە وڵاتە پێشکەوتوو گەشەکردووەکانیش دەژین، هــەژارو دەوڵەمەنــد، تەندروســت بــاش و نــەخۆش، هــاوڵاتی و پەنابــەر دەگرنــەوە. کــەوابێت دیــاردەی دەرمــان و مــادە هۆشــبەرەکان دیاردەیــەکی جیدیی و واقیعی هەموو گۆی زەوییە."[4]

مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی دەکرێن بــە ســێ بەشــەوە لــە پەیوەنــدییان بــە دەرمان و مادە هۆشبەرەکانەوە:

یەکەم: یان بەهیچ جۆرێك دەرمان و مادە هۆشبەرەکان بەکارناهێنن یان ئەوەنــدە کــەم و دووراودوور بــەکاریان دەهێــنن کــە هــیچ کاریگەرییــەکی نییــە لەسەر ڕەوتی ژیانیان؛ ئەم کەم بەکارهێنانە هەموو جۆرەکان ناگرێتەوە. ئەم جــۆرە ئــەو گەنجانــەش دەگرێتــەوە کــە بــۆ تاقیکردنــەوەو بەســەیرو سەمەرەزانینی شتی نوێ جارێك ئەو مادانەیان بەکارهێناوە! ئەم جۆرە کارە

---

[4] World Drug report 2004 of UNODC [online]

بۆ گەنجان زۆر مەترسیدارە چونکە بەهۆی نەشارەزایی و نەناسینی ئەو مادانەوە پێدەچێت تووشی کارەساتی کوژەر ببن" هەندێك مادە بۆی هەیە لە ماوەیەکی کەمدا مرۆڤێك بکوژێت ئەگەر بە رێژەیەکی بەرز بەکاربێت. لەلایەکی دیکەوە چونکە ئەو مادانە گرانبەهاو دانسقەن زۆر کەم وەك خۆیان دەفرۆشرێن و قاچاخچی و فرۆشیارەکانیان مادەی دیکەیان تێکەڵدەکەن بۆ ئەوەی کێشی زیادبکات ئەو مادانە زۆرجار مەترسییان لە دەرمانە ئەسڵییەکە زیاترە.

دووەم: ئەمانە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە مادەکان دەناسن و شارەزای مەترسییەکان هەن بەڵام تەنها لە بۆنەو ئاهەنگەکانداو بە رێژەیەکی دیاریکراوو کۆنترۆڵکراو بەکاریدەهێنن" ئەم جۆرە بەکارهێنانە بۆ هەندێك مادە مەترسی کەمترە وەك ئەلکهول، بەڵام بۆ زۆربەی ئەوانی دیکە هیچ رێنومایییەك نییە بۆ بەکارهێنانیان بە جگەرەشەوە.

سێیەم: ئەوانەی کە ئالودەی دەرمان و مادەهۆشبەرەکان بوون و بەردەوام لەلایەنی جەستەیی و سایکۆلۆژییەوە ناچارن بەکاریان بهێنن شایانی باسە هەموو ئەمانە پەشیمان و کوڵۆڵ و دەستەوسانن و شایانی چارەسەرو پشتگیری پزیشکیین و بە نەخۆش دادەنرێن. خەڵك دەرمان و مادە هۆشبەرەکان بۆ گەلێك مەبەستی جیاجیا بەکاردەهێنن. هۆکارەکان ئەوەندەی جۆرەکانی زۆرو هەمە چەشنن. هەندێك کەس خودەدەنە دەرمان و مادە هۆشبەرەکان بۆ ئەوەی متمانە بە خۆیان پەیدا بکەن و شەرمن نەبن یان بەسەر هەستی خۆبەکەمزانیندا زاڵببن. زۆر لە گەنجان وا دەزانن بە جگەرە کێشان و ئەلکهول خواردنەوەو بەکارهێنانی جۆرەکانی دیکەی

دەرمان گەورەو پێگەیشتوو دیار دەبن و وەك كورد دەڵێت دەبن بە پیاو! لێرەدا كۆمەڵگا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە فێرکردنی گەنجاندا وەك نمونەو چاولێکەری.

لە كۆمەڵگا خۆرئاواییەکاندا ئەلکهول بەشێکە لە ڕێوڕەسمی ئاینیی و كۆمەڵایەتی و ژیانی ڕۆژانە، منداڵەکان هەموو فێردەکرێن کە نابێت تا تەمەنێکی دیاریکراو ئەو مادانە بەکار بهێنن وەك ئەلکهول و جگەرە کە بۆ گەورە یاسایی و ئاساین. هەربۆیە منداڵ و مێرمنداڵەکان چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەن کە یاسا ڕێگایان پێدەدات بەکاریان بهێنن یان هەلێکی نایاساییان بۆ هەڵدەکەوێت و دەستی دەدەنێ ئەم بارە زۆر باوەو کێشەیەکی سەرەکی ئەمڕۆی ئەو كۆمەڵگایانەیە. لە كۆمەڵگا خۆرهەڵاتییەکانیشدا جگەرە بەشێکە لە ژیانی ڕۆژانەی ژمارەیەکی زۆر خەڵك. منداڵەکان یان ئامۆژگاری دەکرێن یان بە هەڕەشەو گوڕەشە دەتۆقێنرێن دژی جگەرەکێشان، ئەنجامەکەشی لە زۆرترین باردا بەخراپ دەشکێتەوەو ئەوانیش بەهەمان شێوە چاوەڕوانی ئەو هەلەن کە لە کۆنترۆڵی گەورەکان قوتاریان ببێت و وا هەست بکەن کە خۆیان گەورەن. ئەوانەی کە دەرمان و مادە هۆشبەرەکان بەکاردەهێنن هەر نەبێت بۆ ماوەیەك شانومان و چالاك دیارن لە بارەی كۆمەڵایەتییەوەو سەرنجی کەسانی دەوروبەر بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن، یان وەك كورد دەڵێت هاوەڵ بۆ خۆیان پەیدا دەکەن. ئەم دیاردەیە بەتایبەتی لەنێو گەنجاندا زۆ برەوی

هەیەو زۆر گەنج واهەست دەکەن کە ئەگەر وەك هاوەڵەکانیان نەکەن ئەوا لاوازو لاکەوتە سەیر دەکرێن و لە باشترین باردا تەنیاو تەریك دەمێننەوەو ئەوان هاوڕێیەتییان ناکەن.[5] کەمی زانیاری و بەهەڵە وەرگرتنی مەسەلەکە هۆکارێکی دیکەی

[5] Westcott, P., (2000) Why Do People Take Drugs? Lewes: Thompson Publishing Ltd.

ئالودەبوونە. زۆر کەس دەڵێن دەرمانو مادە هۆشبەرەکان تەنیا تلیاکەو کەسیشیان نە تلیاکیان بینیوەو نەدەشزانن ڕەنگی چۆنە. لەم بارەدا زۆر بەلایانەوە ئاساییە کە حەبی ڤالیۆمو ئەتیڤان بخۆن یان ئەلکهول بخۆنەوەو جگەرە بکێشن. کەسانێکی دیکە ڕەنگە بڵێن عارەق خراپە بەلام جۆرەکانی دیکە قەیناکات. خەڵکانێکی زۆر لەو باوەڕەدان کە نێرگەلە نیکۆتین دەگێڕێتەوەو ئەو دوکەڵەی کە هەڵیدەمژن نیکۆتینی تێدا نییە یان ئەو توتنە تایبەتەی کە بۆ نێرگەلە بەکاردێت بێزیانە. ئەمانەو چەندەهازانیاری هەڵەی دیکە کە لەشوێنی خۆیاندا یەك بەیەك ڕونیان

دەکەمەوە. دابونەریتی کۆمەڵایەتی ڕۆڵێکی گەورەو بەرچاوی هەیە لەم مەسەلەیەداو ئەوەی کە لەلای کۆمەڵگایەك زۆر خراپو نەفرەت لێکراوە بەشێکە لە ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵگایەکی دیکە. لە وڵاتانی خۆرئاوادا لە کۆنەوە خەڵکی لەسەر خواردنەوەی ئەلکهول ڕاهاتونو جگەرەیان کێشاوەو چاو قاوەیان خواردۆتەوە، ئەوە لە دوای ئەوە لەسەر ئەوە ڕاهاتونو بچوك لە گەورەوە فێربووە. لە هەندێك وڵاتی وەك ئەفغانستانو ئێرانو میسردا ئەو دابو نەریتە پێدەچێت بۆ حەشیشو تلیاكو ئەفیون ڕاست بێت بەلام زۆربەی خەڵك ئەلکهول بە حەرامو نەفرەت لێکراو دەزانن. لە یەمەن خواردنی قات وەك گوڵەبەڕۆژە وایە بەلام ئەلکهول حەرامە. لەهەندێك وڵاتانی ئەمریکای لاتیندا گیای کۆکا کە سەرچاوەی کۆکاینە وەك چاو قاوە بەکار دێت. پەیڕەویکەرانی ئاینی ڕاستافاریان Rastafarian کێشانی کانەبیس بە ئەرکێکی ئاینی دەزانن، ئەم دابو نەریتە ئاینییە لەلای هیندۆسەکانیش هەربەوجۆرەیە لە بۆنەو ئاهەنگەکانیاندا. لە هەرێمی کوردستاندا جگەرەو چا

دوو دیاردەی کۆمەڵایەتی نەك هەر قبوڵکراوو ئاسایی بوون بەڵکو گەلێك جار ئەو کەسەی کە چاناخواتەوە وەك کەسێکی ناکۆمەڵایەتی و نامۆ چاوی لێکراوە، بەتایبەتی لە لادێکاندا. بەڵام ئێستاکە هەڵوێست بەرانبەر جگەرە گۆڕانکاری باشی بەسەردا هاتووەو دێت.

بەکارهێنانی دەرمان وەك بەهێزکەرو چالاککەر لەلای وەرزشەوانەکان بەتایبەتی ئەوانەی کە یاری جوانی لەش ئەنجامدەدەن زۆر برەوی هەیە.

هەندێك دەرمان لەوانەیە بەشێوەیەکی کاتی بەشێك لەو ئەنجامانە بدات بەدەستەوە، بەڵام لە ماوەی دوورودرێژداو بە ڕێژەی زۆرو بەبێ سەرپەرشتی پزیشکی پسپۆڕ مەترسییەکانی زۆر لە دەسکەوتەکانی زۆرترو گەورەترن و ئالودەکەرن.

لە وڵاتانی خۆرهەڵاتدا ئەوەی کە پێی دەوترێت پێشکەوتن و خۆرئاوایانە بوون کاریگەری خۆی هەیە لەسەر خواردنەوەی ئەلکهول خواردنەوە وەك دیاردەیەکی پێشکەوتوو شارستانی چاوی لێدەکرێت لەلای زۆر لە گەنجان و هۆکارێکی یاخیبونیشە بەرانبەر کۆمەڵگا خۆرهەڵاتی و تا ڕادەیەکیش ئیسلامییەکان کە خواردنەوەی ئەلکهول حەرام و نەفرەت لێکراوە. زۆر کەس لەو باوەڕەدایە کە ئەگەر خواردنەوەی ئەلکهول خراپ بوایە کۆمەڵگا خۆرئاواییە پێشکەوتووەکان ئەوەندە تامەزرۆی نەدەبون. من گەلێك جار بیستومە کە دەڵێن ویسکی ڕەنگ جوان دەکات و گەرمت دەکاتەوە، بیرە قەڵەوت دەکات و هتد... خواردنەوەو جگەرەکێشان خەم و خەفەت بەبادەدا!

میدیاش چ ناوخۆیی بێت چ جیهانیی کاریگەری خۆی هەیەو بە هەزاران کەناڵی تەلەفیزیۆنی و ماڵپەڕی ئینتەرنێت پڕوپاگەندە بۆ خواردنەوەی

ئەلکهولو جگەرە کێشان دەکەنو لەگەڵ ژیانی پڕئەندێشەو خەوو خەیاڵی سێکسو ڕابواردندا پێکیانەوە گرێدەدەنەوەو جیهانێك دەخولقێنن کە لەسەر ئەم گۆی زەوییە بەو شێوەیە بونی نەبێتو وایش نیشانی بینەر، بەتایبەتی گەنجان، دەدەن کە ئەو هەموو خۆشییە بەرهەمی ئەلکهولو جگەرەیە کە هەرسووکیان ئالودەکەرن. میدیای ناوخۆ پێدەچێت کاریگەرییەکی زیاتر ڕاستەوخۆو باوەڕپێکراوانەی هەبێتو زیاتر کار لە ژمارەیەکی هەرچی زیاتری گەنجان بکات. بۆ نمونە، ڕزگارکردنی دوو گەنج لە شروب خۆریو دەرمان خۆریو بردنیان بەرەو سەنتەری چالاکی گەنجان وەك دووبارە ڕاهێنانەوەو چارەسەرکردن لە زنجیرە تەلەفیزیۆنی خۆرنەوازاندا خاڵێکی زۆر پۆزەتیف بوو، بەڵام بەرز نرخاندنی خواردنەوەی ئەلکهولو ئەلکهول خۆرەکان وەك ئەڵتەرناتیڤێك بۆ دیاردە کۆمەڵایەتییە کۆنو گەندەڵەکان لە زنجیرەی وەستا جومعەدا خاڵێکی نێگەتیفە لە ڕوانگەی دیدگای ئەمڕۆی جیهانەوە بۆ ئەلکهول.

ئەدەبی کلاسیکی کوردیو زۆر لە گۆرانییە فۆلکلۆرییەکان پڕن لە پیاهەڵدان بە شەرابو خواردنەوەی شەرابدا. من بە تەواوی نازانم هۆکارەکەی چییەو ئەوە جێدەهێڵم بۆ شارەزایانی ئەدەب، بەڵام باوەڕیش ناکەم کاریگەرییەکی خراپی هەبووبێت لەسەر کۆمەڵگاکە لەبەر ئەوەی باسکردنی شەراب لەلایەن مەلا نالی خاکوخۆڵەوە هەروەك باسکردنی دڵداریو ژوانەکان وایەو زیاتر شاعیرانەن!

مەسەلەی خواستو خستنەڕو ڕۆڵێکی بەرچاوی بینیوە لە جیاوازی نێوان خواردنەوەو بەکارهێنانی دەرمانو مادە هۆشبەرەکاندا لە سەردەمە

مێژوویە جیاوازەکاندا. ئێستا دەستکەوتنی، دەتوانین بڵێین هەموو شتێک، تارادەیەکی زۆر ئاسانەو لە زۆرترین باریشدا لەبەردەستدایە، بەڵام لەکۆندا ئەو مەسەلانە زیاتر تایبەت بوون بە دەسەڵاتداران و دەوڵەمەندان و پاشاو داروودەستەکانیان، خەڵکی ئاسایی زیاتر گۆرانی بەباڵایاندا هەڵداوە وەک جیهانێکی پڕئەندێشەو پڕ لە خۆشی و کامەرانی.

جەیمس باربەر لەسەر دیاردەی ئالودەگی لە خۆرئاوا بەم جۆرە دەدوێت:

"لێڤاین (1978) پێمان دەڵێت کە بەر لە سەدەی هەژدەهەم مەسەلەی ئالودەگی یان نەبووە یان زۆر کەمبووە. فەلسەفەی زاڵ لەو سەردەمەدا ئەوە بووە کە مرۆڤ، بەپێچەوانەی ئاژەڵەوە، بەتەواوی لێپرسراوبوون بەرانبەر کردارو ڕەفتارەکانیان بەپێی مەبدەئی لۆژیکی و ئیرادەی ئازاد. توانیویانە خۆیان بڕیار لەسەر ڕادەی خواردنەوەی خۆیان بدەن و ئالودە نەبن" [6]

کێشە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگای هاوچەرخ " گوشاری ژیانی پڕ سەرقاڵی، زۆرانبازی نێوان خواستەکانی مرۆڤ و سنورداری بوارو توانا مادییەکان، جیاوازی و هەڵاواردنە ڕەسەنی و ڕەگەزی و چینایەتییەکان وا لە هەندێک کەس دەکات کە لەنائومێدی و دەستەپاچەییدا پەنا بۆ ئەو مادانە بەرێت.

زیادبوونی ژمارەی تەڵاق و دەستلێکبەردان و جیابونەوە بووەتە هۆی بێبەشبوونی ژمارەیەکی هەرچی زیاتری منداڵ و مێردمنداڵانە لەنازی دایک یان باوک یان هەردوکیان.

---

[6] Barber, J., G., (2002) Social Works With Addictions. 2nd ed. London: Palgrave. P. 13

ئەمەش جارێکی دیکە بە هۆکارێکی دیکە دادەنرێت بۆ ئالودەبوونی گەنجان وەك ڕاکردن لەواقیعی ژیانیان یان گەڕان بەدوای ناسنامە دا لە ئەنجامی تێوەگلان لەباندو تاقمی بەکارهێنی دەرمانو مادە هۆشبەرەکانەوە.

خاڵێکی دیکەی پاڵنەر بەرەو دەرمانو مادە هۆشبەرەکانئارەزوی یاخیبوونو سەرچڵی گەنجانە بەرانبەر دابو نەریتی باوو خواستو ویستی دایكوباوكو مامۆستاو پێشەوا ئاینییەکانو دەسەلاتی حکومەت.

هەندێك جۆری دەرمانو مادە هۆشبەرەکان کێشیان سوکەو کەمتر دەبنە جێگای سەرنجی دەوروبەر، وەك حەب، هەربۆیە بەکارهێنانیان ئاسانترو حازربەدەسترە لە جۆرەکانی دیکەی وەك خواردنەوەی ئەلکهول.

لەڕاستیدا هەندێك جۆریان لە هیچ شوێنێکی ئەم جیهانە ڕاستەوخۆ وەك دەرمانو مادەی هۆشبەری نایاسایی نەناسراونو لە دوکانەکاندا دەفرۆشرێن وەك سیکۆتینو مادە هەڵمژینەکانی دیکە Solvent abuse یان هەندێك دەرمانو حەبی پزیشکین کە خەڵك بەشێوەیەکی هەڵەو بەپێچەوانەی مەبەستی سەرەکی بەکارهێنانیانەوە بەکاریان دەهێنن.



## مێژووی بەکارهێنانی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان

مێژوو تەنها ڕابوردو نییە، بەڵکو کلیلی ئەمڕۆ داهاتووە.

بەکارهێنانی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان ئەوەندەی مێژووی شارستانی مرۆڤ کۆنە لەسەر زەوی. مرۆڤی کۆن بەپێی ژیانی سەرەتایی خۆی هەموو جۆرە گژو گیایەکی تاقیکردۆتەوە، ئەو ڕووەکانەی ناسیوە کە دەخورێن و ئەوانەشی دەستنیشان کردووە کە زیانبەخش و ژەهراوین، پەی بە چەندەها دەرمان و چارەسەری ڕووەکی بردووە کە هەتا ئەمڕۆ تەنانەت لە وڵاتە پیشەسازییە هەرە پێشکەوتووەکانیشدا هێشتا هەر شوێنی خۆیان هەیە. لەم بوارەدا حەکیم و زانای ئەوتۆ پێگەیشتون کە پاشاو کاربەدەستان قۆزیویانەتەوەو وەک دوکتۆرو پسپۆڕی خۆیان کەڵکیان لێوەرگرتوون. بێگومان ئەم ئەزمونانە بەدەر نەبووە لە دۆزینەوەی چەندەها ژەهرو مادەی بکوژو مادەی هۆشبەر. بەڵگەی ئەوە لەبەردەستدایە کە ئەفیون (تلیاک) لەلایەن سۆمەرییەکانەوە 6000 ساڵ پ.ز بەکارهاتووە، دوای ئەوەش لەلایەن یۆنانییەکانەوە وەک دەرمان و هۆکاری ڕابواردن.[] دۆزینەوەی

[7] Drug scope [online]

حەشیش (کانەبیس) لەلایەن حەکیمە چینیەکانەوە لە دەوروبەری ساڵی 2600 ی پ.ز دا، کەدەکاتە 4600 ساڵ لەمەوبەر بە یەکێك لە بەڵگە کۆنەکانی بەکارهێنانی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان دادەنرێت. حەکیمە چینیەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەو مادەیە کەڵکی پزیشکی تێدایەو دەتوانن بۆ چارەسەری نەخۆشی کەڵکی لێوەربگرن، بەڵام هێندەی نەبرد کە بۆیان ڕوونبووەوە کە بەکارهێنانی ئەو دەرمانە بە ڕادەیەکی زۆر، دەبێتە هۆی کاریگەری خراپ لەسەر مێشك‌و ئالودەگی. لەو کاتەوە ئەو دەرمانە وەك بوومەلەرزەیەك کاریگەری خۆی لەسەر کولتوری مرۆڤایەتی جێهێشتووە.[8]
پێدەچێت یەکەمجار ئەلکهول لە ڕێگای ڕێکەوتەوە دۆزرابێتەوە، چونکە گەنینی هەر میوەیەك کە شەکری تێدابێت ،لەژێر کاریگەری گەرمیدا، دەبێتە هۆی دروستبوونی ئەلکهول. ئەفسانەیەکی فارسی هەیە کە باسی پاشایەك دەکات گوایە زۆر حەزی لە تری کردووە، ژێر زەمینی کۆشکەکەی پڕکردووە لە تری بۆ ئەوەی بەشی تەواوی ساڵەکەی بکات. هەندێك لەو کۆیلانەی کە لە ژێرزەمینەکەدا کاریان دەکرد، بەهۆی بۆنی کاربۆن دایۆکسایدەوە کە لە دەنکەتری گەنیوەکان دەردەچوو، ناچاردەبوون بەرەو دەرەوە هەڵبێن. یەکێك لە کارەکەرە پشتگوێخراوەکانی پاشا ویستویەتی خۆی بە بۆنەژاراوی بکات، خۆی کردووە بە ژێرزەمینەکەداو پاشماوەیەك بە گۆرانی ووتن وسەماکردنەوە هاتووەتەوە سەرەوە! بەمجۆرە پاشا بۆی دەرکەوتووە کە ئەو مادەیە بۆ کەیف خۆشکردنی دەستوپێوەندەکانی

[8] Brownlee, (2002) This is CANABIS. London: Sanctuary Publishing. P. 41-42

زۆربەکەڵکە.[9] مێژوونوسان لەو باوەڕەدان کە ئەوەندە بەڵگە بەدەستەوەیە کە بیرەو شەراب لانی کەم 5000 ساڵ پ.ز بەرهەم هاتون. هەر لەو کاتەوە شوێنێکی دیاریان هەبووە لە بۆنەو ئاهەنگە ئایینیو کۆمەڵایەتییەکانداو هەتا ئێستاش هەر هەیانە لە بۆنەی لەدایکبوون، مردن، زەماوەند، تاج لەسەرنانی پاشایانو جەژنەکاندا.[10] بەڵگەی ئەوە بەدەستەوەیە کە 5000 پ. ز لە میزۆپۆتامیا باڕو مەیخانە هەبووە.[11] هەندێك بەڵگە ئەوە دەسەلمێنن کە بیرە بەشێك بووە لە کرێی ڕۆژانەی ئەو کرێکارانەی کە لە پەرستگای وەرکا Erech کاریانکردووە[12]. هەرزوو شارستانییە کۆنەکان هەستیان بە لایەنە خراپەکانی خواردنەوەی ئەلکهول کردووە حامورابی لە ساڵی 1770ی پ.ز دا لە بابل یاسایەکی دەرکردووە بۆ سنوردانان بۆ خواردنەوەی ئەلکهول ئەو یاسایە بە کۆنترین یاسای سنوردانان دادەنرێت بۆ خواردنەوە لە مێژودا. ئەو یاسایانە هەروەك یاساکانی ئەمڕۆ کاتو شوێنی فرۆشتنو خواردنەوەیان دیاریکردووە.[13] هیندۆسەکان لە هیندستان لە دەوربەری ساڵی 1200 پ.ز دا کانەبیسیان بە "گیایەکی پیرۆز" ناوزەد کردووەو 500ساڵێکیش لەوەدوا زەردەشت لە زەند ئاڤێستادا لەگەڵ 10000 گیای پزیشکی دیکەدا ناویبردووە.[14]

---

[9] Armitage, R., (1987) Let's Discuss DRINKING. Hove: Wayland Publishers Ltd. P.9

[10] Ibid

[11] Drug Awareness Studies and their Applications (NCFE Course) UK.

[12] The Guinness Book of records 1997 p. 92

[13] Armitage, R., (1987) Let's Discuss DRINKING. Hove: Wayland Publishers Ltd.P.10

Brownlee, (2002) This is CANABIS. London: Sanctuary Publishing. P.42[14]

پێدەچێت بازرگانە فینیقی و ڕۆمانییەکان بەریتانییە کۆنەکانیان فێری دروستکردنی ئەلکهول کردبێت، بەڵام بەڵگەی زیاترو بەهێزتر لەسەر ئەوەیە کە لەگەڵ هاتن و بڵاوبونەوەی ئاینی مەسیحیدا ئەو پیشەیە پەرەی سەندبێت. پیاوە ئاینییەکان نەك هەر زۆربەی بیرەی وڵاتەکەیان بەرهەم دەهێنا بەڵکو زۆریشیان دەخواردەوە. ئەم کارەیان یەکێك لە قەشە پایەبەرزەکانی ناچارکردووە کە بڕیاریدات "ئەو برا قەشانەی کە زۆر سەرخۆشن و ناتوانن بەشداری دوعاخوێندن بکەن نابێت ڕێگایان پێبدرێت قاوەڵتی بکەن".[15] لە سەدەی دوانزدەهەمەوە باج و خەراج خرایە سەر بەرهەم هێنانی ئەلکهول[16] و بوو بە سەرچاوەیەکی باشی دەرامەت بۆ حکومەتەکان کە هەتا ئێستاش ڕوو لە زیادبوونە" پێدەچێت ئەو دەسکەوتە مادییە گەورەیە بێت کە ئەو برەوە زۆرەی داوە بە ڕێگەدان بە بەرهەمهێنان و فرۆشتن و خواردنەوەی ئەلکهول و کردبێتی بە یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی باج . تەنها لەساڵی 2001 دا 6,897,000,000 پاوەند داهاتی حکومەتی بەریتانیا بووە لە باجی تەنها چوار جۆر لە بەرهەمەکانی ئەلکهول" سەرباری ئەوەی کە ڕێژەیەکی زۆریش بە قاچاخ دێتە نێو وڵات و باجی لێوەرناگیرێت !.[17] ئاینی ئیسلام خواردنەوەی ئەلکهولی حەرام کرد، دیارە ئەم حەرامکردنە کاریگەری پەروەردەیی و گیانی خۆی هەبووەو هەیە لەسەر خەڵکانێکی زۆر، ئەگەرچی ئەلکهول و مادەهۆشبەرەکان لە وڵاتە

---

15 Armitage, R., (1987) Let's Discuss DRINKING. Hove: Wayland Publishers Ltd. P.10

16 Ibid P.11

17 IAS factsheet; Alcohol: Tax, Price and Public Health. [online]

ئیسلامییەکاندا، بە پەنهانی بێت یان بەئاشکرا، هەر شوێنی خۆیان هەبووەو هەیە.

نیک براونلی دەڵێت:

**"پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد لە ساڵی 800ی زاینیدا ئەلکهولی قەدەغەو حەرام کرد بەڵام تیشکی سەوزی دا بە بەکارهێنانی کانەبیس (حەشیش)."** [18] بەڵام ئەم ڕاگەیاندنە هیچ بەڵگەیەکی لە گەڵدا نییە کە ڕاستی و دروستی ئەو مەسەلەیە بسەلمێنێت و زۆر نا ئەکادیمیانە دیارە. پێدەچێت نوسەر ئەو قسەیەی لەسەر ئەو بناغەیە کردبێت کە بەکارهێنانی حەشیش و ئەفیون لە زۆر لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا وەك بەشێك لە کولتورو ژیانی ڕۆژانە بەڕێوەچووەو تا ئێستاش لەزۆر شوێن برەوی هەیە بەڵام ئەوە زۆر دوورە لە ڕێگەپێدانێکی ئاینی ڕەسمی. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی – تیرۆریزم: چونە نێو ناخی دیاردەیەکی جیهانییەوە–جۆرەکانی تیرۆریزم. و. عەتای مەلا کەریم).

لەڕاستیدا ئەگەر لە قورئان و حەدیسدا شتێك، ڕاستەوخۆ، لە دژی حەشیش و مادەهۆشبەرەکانی دیکە نەوترابێت بەڵام بەهیچ کلۆجێك بەڵگەی تیشکی سەوز بەدەستەوە نییە بۆ بەکارهێنانیان. زۆربەی زانایانی ئاینی و پسپۆڕانی بواری تەفسیر لەسەر ئەوە کۆکن کە وشەی خەمر هەموو دەرمان و مادە هۆشبەرەکان دەگرێتەوە بەمانا نوێکەی لە ئیسلامدا هەموو شتێك کە بێهۆشت بکات یان زیانت پێبگەیەنێت یان وات لێبکات کە نەتوانیت پاکوخاوێنی خۆت ڕابگریت قەدەغەو حەرامە. [19] لەساڵی

---

[18] Armitage, R., (1987) Let's Discuss DRINKING. Hove: Wayland Publishers Ltd P. 43

[19] **Islam Online. What does Islam say about Drugs? (online).**

2737 پ.ز دا لە وڵاتی چین چا دۆزرایەوە دەڵێن گوایە بەڕێکەوت گەڵا چایەك کەوتۆتە نێو کوپێك ئاوی گەرمی دەستی پاشاوە![20] چیرۆکەکە هەرچۆنێك بووبێت ئەو مادەیە دۆزراوەتەوەو دوای ئەوەش وورده وورده بە سەرتاسەری جیهاندا بڵاوبوەتەوە. بەڵام قاوە پێش ساڵی 1000 ز لە ئەسیوپیا ناسراوەو وا دەگێڕنەوە کە شوانە بزنێك سەرنجی داوە بزنەکان ووریاو چالاك دەبن بەخواردنی بەری درەختێك، ئەویش تاقیدەکاتەوەو بڵاودەبێتەوە!

لە ساڵی 1000 ز دا عەرەبەکان هێناویانە بەرەو خاکی خۆیان و لەوێ ڕواندویانە. لێرەوە وشەی قاوە بڵاوبوەتەوە وەك (قهوە). هەندێك لە توێژەرەوان لەو باوەڕەدان کە عەرەبەکان دوای حەرام بوونی ئەلکهول پەنایان بردووە بۆ قاوە وەك جێگرەوەیەك. لە ساڵی 1511 دا فەرمانڕەوای مەککە بە دەلیلی ئەوەی کە کاریگەری قاوە پێدەچێت دژایەتی دەسەڵاتەکەی بەهێزبکات قاوە قەدەغەدەکات، بەڵام سوڵتانی عوسمانی دەڵێت قاوە پیرۆزەو فەرمانڕەوای مەککەی لەداراوە.[21] لەدەوروبەری ساڵی 1500 دا قارچکی ئەفسوناوی Magic Mushroom بە پیرۆزدانراوەو پێی ووتراوە " گۆشتی خواوەندەکان". کۆلۆمبۆس لە گەشتەکەیدا بۆ ئەمریکا لە ساڵی 1492 دا توتنی هێنایەوەو لە ساڵی 1586 دا لەلایەن Walter Raleigh وە گەیەندرایە بەریتانیاو لەوێشەوە بۆ سەرتاسەری جیهان بڵاو بوەوە.لە ساڵی 1798 دا سەربازەکانی ناپلیۆن لە میسرەوە حەشیشیان هێنایەوە، کە لەوکاتەدا لەوێ زۆر بڵاو بوو ، بەمجۆرە بە ئەورووپادا بڵاوبوەوە.

---

[20] The History of Tea (online).
[21] A brief History of Coffee (online)

شایانی باسە کە لە سەدەی شانزدەهەمەوە پەلکی کانەبیس وەك گیایەکی بەهێزو جێر لە بەریتانیا بۆ دروستکردنی بەلەمو کەشتیو بەن کەلکی لێوەرگیراوە، بەلام ئەوکاتە وەك مادەی هۆشبەرو دەرمان نەیانناسیوە. تەنانەت پاشا هێنری هەشتەم سزای ئەو جوتیارانەی داوە کە ئەو گیایە ناچێنن![22]

لە سالانی 1800 دا لە بەریتانیا ئەفیون بە ئاشکرا لەسەر شەقامەکان فرۆشراوەو وەك دەرمانێکی بەسود چاویلێکراوە.تەنانەت لە سالی 1839-1842 دا جەنگی نێوان بەریتانیاو چین لەسەر بازرگانی ئەفیون بووە. بەریتانییەکان هەر لە ئەفیون مۆرفینیان دەرکردو ئەو ناوەشی لە morph us خواوەندی خەوەوە بەسەردا دابڕا.لە 1870دا بۆیاندەرکەوت کە ئەفیونو مۆرفین دەبنە هۆی ئالودەگی. ئالودەگی وەك نەخۆشییەکو کێشەیەکی ئەدگاری ناسراو چارەسەرکردنی بۆ پێشنیارکرا، ئەگەرچی ئەو خزمەتە تەنها تایبەت بوو بە چینی ناوەند. لە سالی 1880دا کۆکاین لە بەریتانیا لە دوکانەکاندا فرۆشراوەو لە 1898 دا ئەوانەی کە ئالودەی مۆرفین بوون بە هێرۆین چارەسەریان کردون. لە 1920 دا یەکەم یاسای دەرمانە ترسناکەکان دەرچوو" لە بەریتانیا ئەو بڕیارە پەسەندکرا کە ئالودەکان چارەسەر بکرێن نەك لەداربدرێن. لە 1971 دا یاسایەکی دیکە دەرکراو بڕیاری زینندانیکردنو پیتاك لێسەندن درا بەسەر ئەوانەدا کە دەرمان ومادەهۆشبەرەکان بەکاردەهێنن وەك هۆکارێکی بەرگری لە پەرەسەندنی ئەو دیاردەیە. ئێستاکە لەزۆربەی جیهاندا هەلمەتی بەرگریکردن لە دەرمانو مادە

[22] Brownlee, (2002) This is CANABIS. London: Sanctuary Publishing.

هۆشبەرەکان بەڕێوەدەبرێت و توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زانستی و مەیدانی لەسەر ڕادەی زیانی هەر مادەیەك دەکرێت و ڕێوشوێنی گونجاوی بۆ پێشنیاردەکرێت.

لە بەریتانیا لە ساڵی 1998 ەوە بەرنامەیەکی ستراتیژی بەرفراوان دارێژرا بۆ بەرگریکردن لە دەرمان و مادە هۆشبەرەکان و کەمکردنەوەی زیانەکانیان. ئەو بەرنامەیە لە 2002دا نوێکرایەوەو لە 2004یشدا پێیداچونەوەو لایەنە سەرکەوتوو لاوازەکانیان هەڵسەنگاندەوەو بەرنامەیەکی چڕوپڕتریان دارشت بە ئومێدی ئەوەی کە تا ساڵی 2008 بتوانن بەدەستی بهێنن بەناوی " دەرمان و مادە هۆشبەرەکان لەبێخ دەربێنە، ژیانی مرۆڤەکان بگۆڕە: با کۆمەڵگا لە مەترسییەکانی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان پارێزراوبێت."[23] لەسەر ئاستی جیهانیش لە 27ی شوباتی 2005دا لە جنێف کۆنگرەی نێودەوڵەتی کەمکردنەوەی ئەو مەرگانەی کە جگەرە هۆکاریانە بەستراو بریارەکانی پەسەندکران. ئەم کۆنگرەیە دوای ئەو هۆشدارییە بەسترا کە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ڕایگەیاند: ئەگەر ڕێژەی جگەرە بەم شێوەیەی ئێستا بڕوات ئەوا تا ساڵی 2020 جگەرە ساڵانە 10 ملیۆن کەس دەکوژێت کە لەسەدا حەفتایان لە دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکان دەبن.[24]

[23] Home Office, Drug Strategy Progress Report 2004. Tackling Drugs. Changing Lives: keeping Communities Safe from Drugs. Drug Strategy Progress Report 2004.

[24] **VOA News, GENEVA, Switzerland, Feb. 27, 2005 World's First Anti-Tobacco Treaty Goes into Force.**

## یاسای نێودەوڵەتی و دەوڵەتانی لەمەڕ دەرمان و مادە هۆشبەرەکان

نەتەوە یەکگرتووەکان دەزگایەکی هەیە بەناوی نوسینگەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ دەرمان و تاوان، ئەو نوسینگەیە لەگەڵ دەوڵەتە ئەندامەکاندا هەماهەنگی دەکات بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر دەرمان و مادە هۆشبەرەکان و ڕادەی بەکارهێنانیان لە جیهاندلو قەوارەی زیانەکانیان. تا ئێستا سێ ڕێککەوتنی نێودەوڵەتی مۆرکراوە" یەکەمیان سالی 1962 بەناوی تاکە ڕێکەوتننامە دژی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان کە 180 دەوڵەت ئیمزایان کردووەو سالی 1972 دەستکاریکراوەو دووەمیان سالی 1971 بەناوی ڕێکەوتننامە لەسەر ئەو مادانەی کە بۆ چارەسەری کێشە سایکۆلۆژییەکان بەکاردەهێنرێن و 175 دەوڵەت ئیمزایان کردووەو سێیەمیشیان سالی 1988 بەناوی ڕێکەوتننامە لە دژی بازرگانیکردن بە دەرمان و مادە هۆشبەرەکان و ئەو مادانەشەوە کە بۆ چارەسەری کێشە سایکۆلۆژییەکان بەکاردەهێنرێن و 170 دەوڵەت ئیمزایان کردووە.[25] ڕێکەوتننامەی سێیەمیان نوێترین و گشتگیرترین ڕێکەوتننامەیەو نەک تەنها بازرگانیکردن و بەکارهێنانی مادە هۆشبەرەکان قەدەغە دەکات بەڵکو ڕێوشوێنی هاریکاری نێودەوڵەتیش دیاریدەکات بۆ بەرگرتن لە شەپۆلی هێنان و بردنی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان و ئەو پارەو سامانەش کە لەو بازرگانییە نایاساییەوە دەستیان دەکەوێت.

[25] UNODC 2004 United Nations Office on Drugs and Crime. [Online]

بۆ ئەم مەبەستە سێ لیستیان ئامادەکردووە:

أ- پێی دەڵێن لیستی سەوزو ناوی ئەو دەرمانانەی لەخۆگرتووە کە لەباری ئاساییدا بۆ چارەسەری پزیشکی بەکاردەهێنرێن بەڵام دەکرێت بازرگانییان پێوەبکرێتو بۆ مەبەستی نایاسایی بەکاربهێنرێن.

ب - لیستی دووەمیشیان لیستی سورەو ناوی ئەو مادانەی لەخۆگرتووە کە دەکرێت بۆ بەرهەمهێنانی دەرمانو مادە هۆشبەرەکان بەکاربهێنرێن.

ج - سێیەمیشیان لیستی زەردە کە ناوی هەموو دەرمانو مادە هۆشبەرانەی لەخۆگرتووە کە هەتائێستا ناسراون" لە ئەلفەوە تا ی.[26] بێجگە لەم ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتیانە هەر دەوڵەتەش یاساو ڕێسای خۆی هەیە بۆ کۆنترۆڵکردنو بەرگرتن لە بەکارهێنان یان بازرگانیکردن بە دەرمانو مادە هۆشبەرەکانەوە کە هەندێکیان زۆر توندوتیژنو هەندێکی دیکەشیان هێواشترن. لە عەرەبستانی سعودییە بە شمشێر سەری دەپەڕێنن[27] و لە چەند دەوڵەتێکی دیکەشدا لەسێدارەی دەدەن وەك مالیزیاو سینگاپورو چینو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا" ئەگەرچی ئەو حوکمە لە ئەمریکا کەمتر جێبەجێدەکرێتو بەزۆری زیندانییان دەکەنو بۆ بەکارهێنەرانیش پشت بە دادگای تایبەتی دەرمان دەبەستنو بەرنامەی چارەسەرکردنیان بۆ دادەدەنێن. هەندێك ولاتی وەك ئیسپانیاو ئیتالیاو پورتوگال سیاسەتێکی میانەڕەوانەتریان هەیەو ئەگەر کەسێك دەرمانی پێبگیرێت بۆ مەبەستی

---

[26] International Narcotics Control Board. Vienna International Centre. 2004 [online].

[27] Claire, A.,& Smith, H., (2003) Drug Culture: The Facts Behind the Headlines. P.19.

بەکارهێنانی تایبەتی خۆی نەك بۆ بازرگانی پێدەچێت هۆشیاری بدرێتێ یان جەریمە بکرێت یان ئامۆژگاری‌و ڕێنوێنی بکرێت یاخود وەك لە ئیتالیا ڕودەدات مۆڵەتی لێخوڕینی ئۆتمۆبێلەکەی لێبسەندرێت![28] لە هۆڵەندا بەکارهێنانی هەندێك مادەی وەك حەشیش لە چایخانەکاندا ڕێگەی پێدراوە کە پێیان دەڵێن Brown Cafes بە ڕێژەی 5 گرام بۆ کەسێکی لە 18 ساڵ زیاتر. لەگەڵئەوەشدا دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان لەو وڵاتەدا هەر نایاسایین بەڵام ڕێوشوێنی نەرم‌و هێمنانەیان هەیە بۆ مامەڵە لەگەڵ بەکارهێنەراندا بەتایبەتی بەکارهێنەرانی کانەبیس (حەشیش).

## کام ڕێگا سەرکەوتووترە؟

ئەگەر ڕاپرسییەك بکرێت‌و لە خەڵك بپرسرێت بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، دڵنیام کە زۆربەی هەرەزۆری خەڵك توندترین ڕێگا پێشنیازدەکەن دژی بازرگانانی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان‌و هەندێك دژی بەکارهێنەرانیشی.

زۆربەی زۆری خەڵك، نەك تەنها لە هەرێمی کوردستان بەڵکو لە وڵاتێکی وەك بەریتانیاش، لەو باوەڕەدان کە دەوڵەت لەڕێگای توندوتیژی‌و سزای توندەوە دەتوانێت هەموو شتێك قەدەغە بکات‌و دنیا بکات بە ماستی مەیو! لەڕاستیدا توێژینەوەو بەراوردکردنی سیاسەتی چەندەها وڵات لە سەرپەڕاندنەوە بیگرە تا زیندانیکردن یان جەریمەکردن ئەوەیان دەرخستووە کە ڕێگای توندوتیژی بەوڕادەیە سەرکەوتو نییە کە خەڵکی ئاسایی لێی چاوەڕوان دەکەن" گەر وابوایە ئەوا دەبوایە لە عەرەبستانی سعودی کەس دزی نەکردایە چونکە دەستەکانی دەبڕنەوەو کەسیش دەرمانی نەخواردایە

[28] Ibid P.20.

چـونکە ملـی دەپـەڕێنن، بـەڵام ڕاسـتییەکان وا ناسـەلمێنن. زانـستی کریمینۆلۆجی پشت بەڕادەی سەرکەوتویی یان سەرنەکەوتویی هەر ئەزمونە دەبەستێت لە کەمکردنەوەی تاواندا نەك بە شێوەو ڕوخساری سزاکان.

## بابزانین داتاو ئامارەکان دەڵێن چی؟

بەبەرانبەرکردنی سیاسـەتی میانەڕەوانـەی هۆڵەنـداو سیاسـەتی توندوتیژانـەی ئـەمریکا لەمـەڕ دەرمـانو مـادە هۆشـبەرەکان ئـەم ڕاسـتیانە وەدەرکەوتون: لە هۆڵەندا 16٪ی خەڵك لـە یـەکێك لـە قۆناغـەکانی ژیانیانـدا حەشیشیان تاقیکردۆتەوە بەپێی ڕاپۆرتێکی ساڵی 1999 ، بەڵام لە USA لە ساڵی 2001 دا ڕێژەکە 37٪ بووە.

**ڕێژەی تاقیکردنەوەو بەکارهێنانی کۆکاینو هیرۆین لە 1999 ی هۆڵەنداو 2001 ی USA دا بەم جۆرەیە:**

کۆکاین USA 12٪ هۆڵەندا 0.3٪

هیرۆین USA 1.4٪ هۆڵەندا 0.3بـەپێی ڕاپـۆرتی 1999 تـەنها 2.5٪

لە هۆڵەندییەکان ووتویانە کە کانەبیسیان بـە خـواردن خـواردووە، کـە ئـەمـە دەکاتـە کـەمتر لـە نیـوەی ڕێپێـوی 2001 ی USA[29] بـەهۆی زۆری و جیاوازی یاسای تایبەتی وڵاتانەوە لەمەڕ دەرمانو مـادە هۆشـبەرەکانو بـەو هۆیەشەوە کە مـن خـۆم زیـاتر سەروسـاختم لەگـەڵ یاسـای بەریتانیـدا هەیـە لێرەدا پوختەی یاسای بەریتانیا دەربارەی هـەڵگرتن یـان بازرگـانیکردن بـەو مادانەوە دەخەمەڕوو. شایانی باسە ئەم یاسایانە بەردەوام لـەژێر چـاودێری و پێداونەوەدانو شایانی گۆڕانن لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە.

---

[29] Ibid P.21

لە بەریتانیا دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان پۆلێنکراون بە سەر سێ پۆلی جیاوازدا (لەشوێنی خۆیاندا بەپێی توانا پۆلی هەر مادەیە دەستنیشان دەکەم):

| پۆل | هەڵگری مادەکە (مادەکەی پێبێت) | دابینکەر یا قاچاخچی مادەکە |
|---|---|---|
| A | 7 ساڵ زیندانیکردن‌و جەریمە کردن یان هەردووکیان پێکەوە | زیندانی هەتا هەتایی‌و جەریمە کردن یان هەردووکیان پێکەوە |
| B | 5 ساڵ زیندانیکردن‌و جەریمەکردن یان هەردووکیان پێکەوە | 14 ساڵ زیندانیکردن‌و جەریمە کردن یان هەردووکیان پێکەوە |
| C | 2 ساڵ زیندانیکردن‌و جەریمە کردن یان هەردووکیان پێکەوە | 14 ساڵ زیندانیکردن‌و جەریمە کردن یان هەردووکیان پێکەوە |

دیارە مەسەلەی ڕێگەپێدان یان پێنەدانی مادەیەک لە هەموو شوێنێک ڕێوشوێن‌و مەرجی سەختی خۆی هەیەو ئەمەش بە هیچ کلۆجێک ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو مادەیە یان مادانەی کە یاسا ڕێگەی پێداون مەترسییان نییە، بەڵکو جگەرەو ئەلکهول کە لە ڕیزی بەزیانترین مادەکاندا دەژمێردرێن لە لایەنی تەندروستیەوە لەلایەنی یاساییەوە لە زۆربەی جیهاندا ئازادن‌و کەمترین ڕادەی کۆنترۆڵکردنیان لەسەرە.بەردەوام توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زانستی لە ڕێوشوێنی گونجاو دەگەڕێن بۆ دۆزینەوەی باشترین ڕێگا کە بتوانێت ڕادەی زیانی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان بهێنێتە کەمترین ڕادەی

گونجاوو ژمارەی بەکارهێنەران کەمتر بکاتەوەو ڕێژەی هەبوونی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان لەسەر شەقامەکان بهێنێتە خوارەوەو چارەسەری پزیشکی گونجاو پێشکەش بە قوربانیانی ئەو مادانە بکات‌و زۆرترین ژمارەی منداڵ‌و گەنجان لە زۆنگاوی نەخۆشی ئالودەبوون بەو مادانە دووربخاتەوە لە ڕێگای پەروەردەی گونجاوەوە هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە تا پەیمانگاو زانکۆکان.

# دەرمان و مادە هۆشبەرەکان:
# جۆرەکانی و کاریگەرییەکانیان

1. وورياكەرەوەکان Stimulants
2. هێمنکەرەوە یان کپکەرەوەکان Depressants
3. هەلوەسە هێنەرەکان Hallucinogens


ووریا کەرەوەکان
دەرمان و مادە
هۆشبەرەکان
هێمن
کەرەوەکان یان
کپکەرەوەکان
هەلوسە
هێنەرەکان

# دەرمانو مادە هۆشبەرەکان: جۆرەکانیو کاریگەرییەکانیان

دەرمانو مادە هۆشبەرەکان بە شێوەیەکی گشتی دەکرێن بە سێ بەشەوە:

1- وریاکەرەوەکان Stimulants " ئەمانە لەسەرەتادا مرۆڤ زیتو وریادەکەنەوەو هەموو شتێك خێراو تیژڕەو دیاردەبێت بە بیرکردنەوەو قسەکردنو جوڵەکانی لەشیشەوە. ئەم جۆرانە چونکە کار دەکەنە سەر کۆئەندامی نارەندی دەمار دەبنە هۆی بەرزکردنەوەی فشاری خوێنو بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی لەش کە دەبێتە هۆی ئارەقکردنەوەیەکی زۆر. هەروەها دەبنە هۆی هەناسەبڕکێو کەمکردنەوەی ئارەزووی خواردن (ئیشتیهاو) بێخەوی. بەکارهێنەران بەزۆری متمانە بەخۆو توندڕەودیارنو چەنەبازن. نمونەکانیان: ئەمفیتامینەکان Amphetamines ، کۆکاین ، کراك کۆکاین، کافاین، ئێکستاسی Ecstasy یان MDMAو Alkyl Nitritesن.

2ـ هێمنکەرەوە یان کپکەرەوەکان Depressants" ئەمانە بەپێچەوانەی وریاکەرەوەکانەوە هەموو شتێك هێواشدەکەنەوە بە بیروهۆش و قسەکردن و جوڵەکانی لەشیشەوە. کاریگەری ئەم جۆرە دەرمانانە لەسەر کۆئەندامی ناوەندی دەمار دەبنە هۆی کەمبوونەوەی هەست و دابەزاندنی فشاری خوێن و لێدانی دڵ و هەناسەدان. هەروەها دەبنە هۆی سەرخۆشی و قسەی هەلەقەلەق و پچرپچڕ جوڵان و ڕۆیشتنی نارێکوپێك. نمونەکانیان: ئەلکهول، هێورکەرەوەکان Tranquillisers، هەڵمژینەکان و سیکۆتینەکان Solvents & Glue و هیرۆین و بەرهەمەکانیتی.

3ـ هەلوەسە هێنەرەکان " Hallucinogens ئەمانە مرۆڤ تووشی هەلوەسە و دڵەڕاوکە و وڕێنە دەکەن و هەستەکانی دەشێوێنن و شێوازی بینین و بیستن و هەستپێکردنی بۆ جیهانی دەوروبەری دەگۆڕن. ئەو کەسانەی کە ئەم جۆرە دەرمانانە بەکاردەهێنن شتی نادروست و ناواقعی دێتە بەرچاویان و شتی سەیروسەمەرە دەبیستن و بۆن دەکەن کە لەڕاستیدا نین.

پێدەچێت توشی Paranoia شێتیی خۆ بەگەورەزانین(جنون العظمة) ببن. هەروەها تووشی دڵەڕاوکێ و بەدگومانی و دڵپیسی دەبن و ڕەفتار و مەزاجیان بەشێوەیەکی نارێکوپێك ئەمسەراوسەر دەکات" لە خۆشییەوە بۆ ناخۆشی و بەپێچەوانەوە. نمونەکانیان: LSD، DMT، قارچکی ئەفسوناوی Magic Mushroom و حەشیش (کانەبیس) Cannabis ن.

## وورياكەرەوەكان Stimulants

1. **ئێکستاسی** Ecstasy ناوە کیمیاوییەکەی **3,4 methylenedioxymethamphetamine** بۆ کورتکردنەوە پێی دەڵێن MDMA. ئێکستاسی بە دەیان ناوی سەرشەقامو ناوبازاڕیی هەیە لەوانە کۆتر، پسکیتی سەما، سوپەرمان، میکی ماوس ، کاستەر، ئادەم، کۆتری سپیو چەندەها ناوی دیکە کە سەدام حسەینی دیکتاتۆری لێکەوتەی عێراقیش یەکێك لەوناوانەی پێبڕاوە ![1] ئەم مادەیە لەشێوەی حەبی جۆراوجۆردایە بە شێوەو قەبارەو ڕەنگی جیاواز کە هەندێکیان یان وێنە یاخود ئارمێکیان لەسەرە.

یەکەمجار لە ساڵی 1912 دا لەلایەن زانا ئەڵمانییەکانەوە دۆزرایەوەو چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرا کە دەرمانێکی بەسود بێت، بەڵام هەرگیز وا نەبوو.لە ساڵانی 1950کاندا جارێکی دیکە لە ئەمریکا دۆزرایەوە لەلایەن ئەلیکساندەر شولگینەوەو لەسەر خۆی تاقیکردەوە.سوپای ئەمریکا بۆ زانیاری هەڵهێنجان لە زیندانییەکانو پەکخستنی سوپای دوژمن کەڵکی لێوەردەگرت.[2] لەبەرئەوەی ئەم دەرمانە توانایەکی باشی هەیە لە هەستی پێکەوەگونجاندا لەسەر بەکارهێنەرەکانی پزیشکە ئەمریکییەکان بۆ یەکخستنەوەی خەڵك، بەتایبەتی ئەو هاوسەرانەی کە خەریك بوو پەیوەندی هاوسەرێتییان هەڵدەوەشایەوە بەکاریان دەهێنا. هەتا ئێستاش لە سویسرا هەندێك لە نوشدارەکان

---

[1] **Hammersley, R., et al., (2002) Ecstasy: and the rise of the Chemical Generation.London: Routledge.** P. 40

[2] **Drug Scope [online]**

بۆ ئەم مەبەستە بەکاریدەهێنن. لەگەڵ ئەوەشدا لەئەنجامی هەندێك ئەزموونەوە کە لەسەر مشك کران و ئەوەیان دەرخست کە پێدەچێت ئێکستاسی لەهەندێك لایەنەوە مێشك تێکبشکێنێت، ئەو دەرمانە لەساڵی 1985دا لە ئەمریکا قەدەغەکرا. لە بەریتانیا لە ساڵانی ڕابوردودا زۆر بەکاردەهات و گەنجان بەتایبەتی ئەوانەی کە لە یانە شەوانەکاندا سەمایان دەکرد بەکاریان دەهێنا. بەپێی ئاماری تاوانەکانی بەریتانیا 2003/2002 ئێستا بەکارهێنانی ڕوو لە کزییە.[J] لەماوەی 15 ساڵی ڕابوردودا ئێکستاسی لێپرسراوە بەرانبەر مردنی 200 کەس لە بەریتانیادا. زۆربەی مردنەکان بەهۆی کاریگەرییە لاوەکییەکانەوە بووە نەك ڕاستەوخۆ بەهۆی ژاراوی بوونەوە بە دەرمانەکە" وەك لەکارکەوتنی دڵ لەئەنجامی بەرزبوونەوەیەکی زۆری فشاری خوێنەوەو دڵە خورپەو ووشك بوونەوە لەئەنجامی کەمی شلەمەنییەوە یاخود خواردنەوەیەکی زۆری ئاو بەڕادەیەك کە بووەتە هۆی مردنی ئەو کەسە. چونکە ئێکستاسی کار لە کارکردنی گورچیلەکان دەکات و چالاکییان سست دەکات لەوکاتەدا کۆبوونەوەیەکی زۆری شلەمەنی لەلەشداو بەتایبەتی لە خانە هەستیارەکانی مێشکدا دەبێتە هۆی پەککەستنی چالاکی ژیانیی وەك لێدانی دڵ و هەناسەدان. ئاشکرایە کە تێکەڵکردن و بەکارهێنانی دوو دەرمان یان زیاتر پێکەوە مەترسی زۆر گەورەی هەیەو زۆر کەس ئەلکهول لەگەڵ دەرمانەکانی دیکە تێکەڵ دەکات و بەمەش مەترسییەکەی چەند بەرانبەر زیاد دەکات.

زۆر جار ئەو حەبانەی کە بەناوی ئێکستاسییەوە دەفرۆشرێن لەڕاستیدا ڕادەی مادەی ئێکستاسییان زۆر جیاوازەو هەندێك حەب بینراوە کە بە

---

[J] Drug Scope [online]

ئێکستاسی فرۆشراون بەڵام لەبنەڕەتدا دەرمانی پاککردنەوەی حەوزی ماسی یان دەرمانی گەرمکردنەوەی سەگ بوون، لە هەندێك حەبی دیکەدا مادەی ئەمفیتامین‌و کیتەماین دۆزراونەتەوە.[4] ئێکستاسی دەرمانێکی وورياکەرەوەیە بەڵام کاریگەرییەکی هەلوەسەیی سوکیشی هەیە. ئەوانەی کە ڕادەیەکی مامناوەندی لێوەردەگرن کاریگەرییەکانی دوای 20-60 خولەك لەسەریان دەردەکەوێت ( زیاتریشی پێدەچێت ئەگەر بە گەدەی پڕەوە بخورێت) ئەو کاریگەرییە بۆ ماوەی 3 تا 6 کاتژمێر دەمێنێتەوە.

بەکارهێنەران ڕەشێنەی چاویان گەورە دەبێت، کاکیلەکانیان توندد‌ەبێت‌و تووشی خەواڵوییەکی کورت‌و ئارەقکردنەوەو دەم وقوڕگ ووشکی دەبن. فشاری خوێنیان بەرز دەبێتەوەو لێدانی دڵیان زیاد دەکات‌و کەمی ئارەزوویان بۆ خواردن (کەمی ئیشتیها) شتێکی زۆر بڵاوە لەنێوانیاندا.

زۆر لە بەکارهێنەران بە قۆناغێکی هەست بە پەلە کردندا تێدەپەڕن‌و دوای ئەوە هەست بە چالاکی دەکەن‌و لەکۆتاییشدا هێوردەبنەوە. زۆربەی جار کەسەکان وا باسدەکەن کە توڕەییان نامێنێت‌و لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا هەست بە لەیەك گەیشتن‌و دۆستایەتی دەکەن‌و توانای گفتوگۆیان زیاد دەکات. هەندێك لە بەکارهێنەران بینراون هەست بە خۆشییەکی زۆر دەکەن سەبارەت بە دەوروبەرەکەیان‌و زۆر تامەزرۆی میوزیك دەبن‌و هەستە سێکسی‌و حسییەکانیان وەسەردەکەون.

هەندێك لە بەکارهێنەران ئەزمونی ناخۆشیان دێتە ڕێ. لەوانەش پێدەچێت هەست بە ترس‌و دڵەڕاوکێ‌و بێزاری‌و شێوانی هەستەکانیان‌و

---

[4] Ibid

بەرزونزمکردنیان لە شێوازە هەرە باوەکانیان بن. ئەم بارە پەشێوە پێدەچێت، بەشێوە مەزاجێك یان بەشێوەیەکی دیکە، چەندەها ڕۆژو بگرە هەفتەش بخایەنێت. ئەم بارە زیاتر ئەگەری دەبێت ئەگەر بەکارهێنەر بڕێکی زۆری وەرگرتبێت یان خۆی لەخۆیدا هەست بە پەشێوی و شپرزەیی بکات.

کاریگەرییە سەرلێشواوییەکان ئەگەری کارەسات زۆر زیاتر دەکەن. زۆربەی ئەوانەی کە مردون بەهۆی سەما کردنیانەوە بووە بەبەردەوامی لە یانە گەرمە، قەرەباڵخەکاندا کە بوەتە هۆی زۆر بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش و شکهەڵاتن. پێدەچێت پشودان و خۆفێنك کردنەوەو ئاو خواردنەوە بۆ ئەوەی جێگای ئاوە ڕۆیشتووەکە بگرێتەوە کە بە ئارەقکردنەوە دەردراوە، بتوانێت بەر لەو کارەساتانە بگرێت. دوای بەکارهێنانی ئێکستاسی بەکارهێنەران پێدەچێت زۆر هەست بە ماندویی بکەن و پێویستیان بە خەوتنێکی دوورودرێژ هەبێت بۆ ئەوەی ئاسایی ببنەوە. ئەم بارە ڕەنگە سێ تا چوار ڕۆژ بخایەنێت، کە پێی دەڵێن هێوربوونەوە.

بەکارهێنانی ئەم مادەیە بەبەردەوامی لەوانەیە ببێتە هۆی پەشێوی لەخەوتندا، بێهێزی و لاوازی، کێشەی خواردن و بەدخۆراکی بەAnorexia Nervosa وە (ئەم نەخۆشییە بریتییە لە هەستکردنی ئەو کەسە کە کێشی زیادەو خواردن ناخوات، لەکاتێکدا لانی کەم چارەکێکی کێشی ئاسایی خۆی لەدەستداوە)[] و کەسەکە هەست بە پەستی و دڵەڕاوکێ دەکات. بەدوای ئەوەدا پێدەچێت زیاتر هەستیار بێت بەرانبەر سەرماو هەڵامەت و قورگ یەشەو هتد... لەکاتێکدا ئەم دەرمانە نابێتە هۆی ئەوەی کە لەش، لەبارەی جەستەییەوە، خوی پێوەبگرێت،

---

[5] Macpherson, G., MB, BS (2002) Black's Medical Dictionary. 40th edition, London: A&C Black Publishers Ltd. P. 192

خوگرتنی سایکۆلۆژی بە هەستە زۆرخۆشەکان Euphoriaو هێمنیو هەموو ئەو هەلومەرجانەی کە چواردەوری بەکارهێنانی ئێکستاسیان دلوە لەوانەیە دروست ببێت.

گۆڕانە کورتخایەنەکان لە مەزاجدا بە "بێتاقەتی ناوەڕاستی هەفتەشەوە" کە بەدوای بەکارهێنانی دەرمانی کۆتایی هەفتەدا دێت، لەگەڵ پەککەوتنی بیروهۆشی شت بیرکەوتنەوە بۆ ماوە کورتەکان Short term memory لەوانەیە هەندێك لە ئاسەوارە بچوکەکانی بەکارهێنانی MDMA بن. ئاسەوارە کاریگەرە کۆئەندامی دەمار ژاراویکەرەکانی Neurotoxicity دیکەی MDMA وەکو گۆڕانە ڕەفتاریو هەڵسوکەوتیو سۆزدارییەکانی بەکارهێنەرو ڕادەی هەند بوونیان، بەتایبەتی لەماوەی دوورودرێژدا، تا ئێستا ڕوون نین.

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە تێکشکاندنی مێشك پەیوەندی نییە بە مێژوویەکی دوورودرێژی بەکارهێنانەوە، بەڵکو پەیوەندی هەیە بە ڕێژەی بەکارهێنانی ئەو مادەیەوە لە یەك کاتی دیاریکراودا" واتە کاریگەرییەکانی ئەو مادەیە بەگوێرەی زیادو کەمکردنی مادەکە دەگۆڕێت Does-Dependent. لە هەمانکاتدا زانایان لەوباوەڕەدان کە پێناچێت ئەو تێکشکانو گۆڕانکاریانە کە بەسەر مێشکدا دێن بەتەواوی بگێڕدرێنەوە بۆدۆخی ئاسایی خۆیان.[6] لە بارەی یاساییەوە ئێکستاسی لە بەریتانیا بە دەرمانی پۆلی A ناوزەدکراوە.

[6] Drug Scope [online]

## 2. ئەمفیتامینەکان Amphetamines





کۆمەڵێك دەرمانی دیکەن لە گروپی وورياکەرەوەکان کە بەشێوەیەکی ناسروشتی بەرهەمدەهێنرێن. ئەم مادانە لەسەر شەقامەکان و ناویازاڕدا بە گەلێك ناو دەناسرێن وەك خێرا، گیزەگیز، سولفات، بیلی، ئەمف و بڵند و هتد... لەشێوەی تۆزێکی خۆڵەمێشی یان سپیدا دەفرۆشرێن کە بەشێوەی قوتدان وەك حەب، کرۆشتن، هەڵمژین، دەرزی یان تواندنەوەیان لەناو شلەمەنیدا بەکاردەهێنرێن. ئەمفیتامینەکان یەکەمجار لە ساڵی 1800دا دۆزرانەوە بەلام

بەکارهێنانیان بۆ مەبەستی پزیشکی تا ساڵی 1930 وەدەرنەکەوت. لەو کاتەوە بۆ مەبەستی بەرگرتن لە فشاری نزمی خوێن و یارمەتیدانی نەخۆشانی ڕەبو بۆ ئەوەی باشتر هەناسەبدەن و هەروەها بۆ کەمکردنەوەی ئارەزوی خواردن بەکاردەهاتن. دوای ئەوە ئەم مادانە بۆ چارەسەرکردنی گەلێك نەخۆشی بەکاردەهاتن وەك بێخەوی، پەرکەم، شەقیقە، خەمۆکی و زۆر بزێوی منداڵ. لە ساڵانی 1950کان و 1960ەکاندا بەشێوەیەکی بەرفراوان وەك دەرمانی خۆلاوازکردن خرانە بازاڕەوە.

لـە کـاتی ئێـستادا بـەکارهێنانی ئەمفیتامینـەکان بـۆ مەبەسـتی پزیـشکی بەشێوەیەکی بەرچاو دابەزیوە ئەگەرچی هێشتا هەر بۆ مەبەستی گرفتـەکانی خەو بەکاردەهێنرێن. دوای بەکارهێنانێکی زۆری ئەم مادانە یان مادەی دیکـە کە هەمان کاریگـەرییان هەیـە وەك ڕیتـاڵین Ritalin لـە ئـەمریکا بـۆ ئـەو منداڵانەی کە کێشەی بزێوی و ڕەفتاریان هەیە، بـەکارهێنانی ئـەم مادەیـە بـۆ ئەو مەبەستە ئێستا لە بەریتانیا ڕوو لە زیادییە.

کاریگەری وورياکەرەوەی ئەمفیتامینەکان بووە هۆی بەکارهێنانێکی زۆریان لەلایـەن سـەربازەکانەوە بـۆ ئـەوەی بـەرەنگاری ئـەو بێتاقـەتی و پەسـتییە ببەنـەوە کـە بـە "پەسـتیی شـەڕ" ناسـراوە. وا خـەمڵێنراوە کـە هێزەکـانی بـەریتانیا لـە جـەنگی جیهـانی دووەمـدا 72 ملیـۆن حـەبیان بـەکارهێنابێت. گەلێك هێزی سەربازی ئەڵمانی و یابانیش ئەم حەبانەیان بەکارهێناوەو دەڵێن گولیە هێتلەر خۆی ڕۆژانە دەرزی ئەم مادانەی لێدراوە ![7]

ئەم بەکارهێنانەی ئەمفیتامین لە نێو هێزە سەربازیەکاندا لە لایـەن سـوپای ئەمریکییەوە بەردەوام بووە لە جەنگەکانی کۆریاو ڤێتنامدا. واباسدەکەن کـە ئەنتۆنی ئێدنی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا پێویستی بەم مادەیـە هـەبووە بـۆ ئەوەی لەگەڵ تەنگەشەی کەناڵی سویسی ساڵی 1956دا هەڵبکات ![8]

لە بەریتانیا تا ساڵی 1956 زۆربـەی ئـەو دەرمانانـەی کـە ئـەمفیتامینیان تێدایە بەبێ پێویست بـوونی ڕاچـێتەی دوکتـۆر لـە دەرمانخانـەو دوکانەکانـدا دەفرۆشران و لەلایەن ئەو ژنانەوە کە بەهۆی کاری ناو ماڵەوە بێزارو بێتاقەت بووبوون یان ئەو کەسـانەی کـە خۆیـان بـە بێهێـز دەزانـی و پێویـستییان بـە

[7] Drug Scope [Online].
[8] Ibid

مادەی بەهێزکەر هەبوو بەکاردەهاتن. هەروەها لەناو ئەو کەسانەدا باوو بوو کە بۆ ماوەی دوورودرێژ کاریان دەکرد وەکو شۆفێری لۆرییە بارهەڵگرەکان کە گەشتی دوورودرێژ ئەنجامدەدەن.

لە سالانی 1960کاندا بەکارهێنانی ئەمفیتامین لەبەریتانیا بۆ مەبەستی دیکەی ناپزیشکی پەرەیسەند بەتایبەتی لەنێو گەنجانداو بوەهۆی تێوەگلانی هەزاران گەنج لەو کێشەیەدا کە بە یەکەم کێشەی دەرمانی دوای جەنگ ناسراوە" هەروەها بووە جێگای سەرنج و تۆقینی میدیاکان و بەمجۆرە لە سالی 1964 دا هەبوون یان گلدانەوەی ئەمفیتامین بەبێ مۆڵەتی ڕەسمی قەدەغەکرا.

لە سالانی 1970 کان و 1980کاندا بەکارهێنانی ئەمفیتامین لەسەر شەقام و ناوبازاڕدا پەرەی سەند و نەوەیەکی دیکەی گەنجانی لەخۆیەوە ئالاند لەو یانانەدا کە بەدرێژایی شەو کراوە بوون. بەرهەمهێنانی نایاسایی تۆزی ئەمفیتامین و هەڵمژینی ئەو مادەیە جێگای ئەوەی گرتەوە کە لەوەپێش حەبەکانیان لە کارگەکان دەدزی.

کاریگەرییە هەنوکەییەکانی ئەمفیتامینەکان بریتییە لە حەوانەوەو هەست بەخۆشی کردن" مێشکی ئەو کەسە ئارامدەگرێت و هەست بە متمانەبەخۆبوون و چالاکی دەکات. هەندێك کەس دوای بەکارهێنانی ئەم مادەیە هەست بە توڕەیی و دڵەڕوکێ دەکەن. ئەو ئاسەوارانە بەزۆری دوای دەرچوونی مادەکە لەلەش نامێنن. کاریگەری یەك ژەم بۆماوەی 4–8 کاتژمێر لەلەشدا دەمێنێتەوە بەڵام تا ماوەی 4 ڕۆژ لەڕێگەی پشکنینی میزەوە دەدۆزرێتەوە.

بەکارهێنەرانی ئەمفیتامینەکان هەست بە ماندووی و خەمۆکی دەکەن بۆماوەی یەك یان دوو ڕۆژ دوای بەکارهێنانی مادەکەو هەندێك جار زیاتریش. ئەوانەی کە ڕادەیەکی بەرز لەم مادەیە بەبەردەوامی بەکاردەهێنن زانراوە کە دوای چەند ڕۆژێك هەست بە ترس و هەلوەسە دەکەن. بەکارهێنانی بۆ ماوەی دوورودرێژ دەبێتە هۆی فشارخستنە سەر دڵ و بۆ ئەوانەی کە فشاری خوێن یان کێشەی دڵیان هەیە زۆر مەترسیدارە. بەکارهێنانی بە بڕی زۆرو بۆماوەی دوورودرێژ ڕەنگە ببێتە هۆی توشبوون بە نەخۆشییە ژیرییەکان Mental Illness. هەندێك کەس لەگەڵ بەکارهێنانی ئەم مادەیەدا ڤیاگرا بەکاردەهێنن" ئەمەش مەترسی توشبون بە نەخۆشییەکانی دڵ زیاتردەکات.

وەکو هەموو دەرمانەکانی دیکە شێوەی بەکارهێنانی ئەمفیتامینەکان بڕیار لەسەر ئەوەدەدات کە کاریگەری دەرمانەکە چەند خێرا بێت و چەندیش بەهێز بێت. ئەگەر لەشێوەی حەبدا بەکاربێت ئەوا هێواشترە بەلام ئەگەر لەشێوەی هەڵمژین و دەرزیلێداندا بەکاربێت ئەوا خێرایەو بەپێی ڕادەی زۆری و کەمی مادەکەش کاریگەرییەکەی دەگۆڕێت.

بەکارهێنانی بەردەوامی ئەمفیتامینەکان دەبێتە هۆی خوگری سایکۆلۆژی و بەکارهێنەران هەست بە بێهێزی، بێتاقەتی ، پەستی و برسێتییەکی زۆردەکەن ئەگەر دەرمانەکە بەکارنەهێنن. هەربۆیە بەردەوام دەیانەوێت بگەڕێنەوە دۆخی پێشوو دەرمانەکە بەبڕی زیاتر بەکاربهێنن. بەمجۆرە لەشیان لەگەڵ ئەو مادیە ڕادێت و بەردەوام پێویستیان بەبڕی زیاترو وزیاتری ئەو مادەیە هەیە بۆ ئەوەی هەست بە کاریگەری یەکەمجار بکەن.

بەردەوام بەکارهێنانی ئەمفیتامینەکان دەبێتە هۆی بێخەوی و بێخۆراکی و کەمبونــەوەی بــەرگری بەرانبــەر نەخۆشــی. کێــشەکانی کــەمخۆراکی وەك Anorexia Nervosa لەوانەیــە ببنــە کێــشە بەتایبــەتی لــەنێو ژنــانی بەکارهێنەردا. کاروباری ڕۆژانەیان پێدەچێت پەکی بکەوێت و زۆر لەوانەی کە بەزۆری بــەکاری دەهێنن بــەردەوام لــەنێوان هەسـتکردن بەشـادی و چالاکی بــەکارهێنان و بێتاقــەتی و بێهێــزی لێبڕانــدا جۆلانــە دەکــەن. هەنــدێك لــە بەکارهێنەران تووشی شەپۆلی توندوتیژی دەبـن و لەوانەیـە زۆر پـەلاماردەرو شەڕانی بن.

کێشەیەکی دیکـەی ئـەمفیتامین کێشەی پوختەییـەتی. لەسـەر شـەقام و ناوبـازاڕدا ڕادەی پوختــەیی ئـەم مادەیـە کـەمتر لـە 15٪ یـەو زۆر جـاریش فرۆشیارەکانی تـەنها 10٪ ئـەمفیتامینی تێدەکـەن و ئەوەکـەی دیکـەی تـۆز (پاودەر)ی دیکەی وەك گلوکۆز، ڤیتامین سی، مادەی ناوسك دامالەر، شیری وشکی منال، کافاین و دەرمانی دیکەی وەك پاراسیتامۆڵ و ئەسپرینە.

جــــۆرێکی دیکــــەی دەرمانەکــــە کــــە بــــەهێزترە میــــسئەمفیتامینە Methamphetamine کە لەشێوەی تۆزو کریستاڵدا دێت کـە پێیـدەڵێن سەهۆڵ و هەروەها لەشێوەی حەبیشدا هەیە.

لەلایەنی یاساییەوە ئەمفیتامینەکان لە بەریتانیا لە پۆلی B دانراون، بـەلام ئەگەر لەشێوەی دەرزیدا ئامادەکرابن دەچنە پۆلی A.



## 3.کۆکاین و کراك :Cocaine and Crack

کۆکاین لە گەڵای دەوەنێك دەردەهێنرێت کە لە ناوچە شاخاوییەکانی ئەمریکای باشور لە وڵاتانی وەك بۆلیڤیاو کۆلۆمبیاو پیرۆ بەشێوەیەکی سروشتی دەڕوێت و پێی دەڵێن *Erythroxylum coca* . بۆیە دەڵێین دەوەن چونکە لەڕاستیدا ئەو لە دار بچوکترەو لە ڕووەکیش گەورەترەو گەڵێك پەلوپۆی لێدەبێتەوە. لە سەرشەقام و ناوبازاڕدا بە کۆك، چارلی، بەفر، C، چەو، تۆز، بەرد، سپی و گەڵێك ناوی دیکەشەوە ناسراوە.

مێژووی خواردن و داکرۆشتنی گەڵای کۆکا وەك یارمەتیدەرێك بۆ کارکردن لەنێو هیندییە سورەکانی باشوری ئەمریکادا پێدەچێت کە بگەڕێتەوە بۆ 2500 تا 3000 ساڵ پ.ز . گەڵێك بەڵگەی مێژوویی لەشێوەی نەخشی گڵێنە و ئاسەواری مێژوویی دیکەدا دۆزراونەتەوە کە وێنەکانیان ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن.[9] چایەکی بەنێوبانگی ئەمریکای باشور هەیە ناوی mate de coca یە ئەویش هەر لە گەڵای ئەو درەختە دروستدەکرێت. دۆشاوی کۆکا کە بە basuco ناسراوە شێوەیەکی ئەو دەرمانەیە کە دەکێشرێت و لە گەڵای ئەو درەختە دەردەهێنرێت و لەو وڵاتانە دەکێشرێت کە درەختەکەی لێ دەڕوێت.

---

[9] Freud's Magical Drug [online]

کۆکاین بۆیەکەمجار لە ساڵی 1855 دا لە گەڵای ئەو درەختە دەرهێنراو تا ساڵانی 1870کان دەرمانێکی بەناوبانگی وریاکەرەوەو شادیهێنەربوو بۆ چارەسەری گەلێك نەخۆشی سووك بەکاردەهات. شیکارکەری دەروونی بەناوبانگ سیگمۆند فرۆید ڕێنومایی بەکارهێنانی ئەو دەرمانەی کردووە بۆ چارەسەری گەلێك کێشەی نۆژداری و سایکۆلۆژی لەوانە ئالودەگی بە ئەلکهول و مۆرفین. بەلام کاتێك ڕێنومایی هاوڕێیەکی کرد بۆ بەکارهێنانی کۆکاین بۆ ئەوەی لە ئالودەگی مۆرفین قوتاری ببێت و هاوڕێکەی بەهۆی زیادەخۆرییەوە لە کۆکاین مرد، فرۆید بیرورای خۆی گۆڕی.

پزیشکەکانیش بۆ سڕکردنی ناوچەیی (بەنجکردنی بەشێکی لەش) و ددانسازی بەکاریاندەهێنا. لە گەڵای کۆکا مەی دروستکراوەوساردی کۆکاکۆلا لەبنەڕەتدا وەك (خۆشیبەخشێکی بەنرخی مێشك و چارەسەری هەموو کێشە دەمارییەکان) فرۆشراوەو تا ساڵی 1904 یش کەمێك مادەی کۆکاینی تێدا بووە.[10]



لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا پزیشکەکان هۆشدارییاندا لەسەر ئەگەری خوگری و کێشەی دیکەی بەکارهێنانی کۆکاین. لە ئەمریکا لەنێو سپی پێستەکاندا ترسی ئەو ڕەشپێستانە پەرەیسەند کە شێتی کۆکاین بوون و

---

[10] **Drug Scope [Online]**

یاخیبون دژی یاسا نوێ هەڵاوێردنەکان. لە بەریتانیاش ترسی بەکارهێنانی ئەو مادەیە لەلایەن هێزە سەربازییەکانەوە لە جەنگی جیهانی یەکەمدا تەشەنەی کردو ڕۆژنامەکان بە شێوەیەکی شێتگیران لەسەریان نوسی‌و وایاندلیە قەڵەم کە ئەوە پلانێکی ئەڵمانەکانە بۆ تێکوپێکشکاندنی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی. لە ساڵی 1916 دا یاسای کرتوپڕی هێنرایە کایەوە بۆ قەدەغەکردنی هەڵگرتنی کۆکاین‌و ئەفیون‌و کەمکردنەوەی بەکارهێنانە پزیشکییەکانیان.

ئەگەرچی لەمێژەوە کۆکاین لە بەریتانیادا هەبووە، بەڵام تا ناوەڕاستی 1970کان بەکارهێنانی کۆکاین نەبوو بووە باو. هەڵمژینی تۆزی کۆکاین بوو بە مۆدە لەنێو چینە نێوەندە (قیت‌و قۆزو کەشخەکاندا)و وەکو دەرمانێکی گرانبەها شانازی پێوەدەکرا.

لەهەمانکاتدا لە ئەمریکا بەکارهێنانی کۆکاین زیاتر بڵاوبووەوەو لە ناوەڕاستی 1980کاندا جۆرێکی نوێ بەهێزتری دەرمانەکە کەوتە بازاڕەوە" کۆکاینی ئامادە بۆ کێشان (وەک جگەرە) کراک کە لە تۆزی هایدرۆکلۆرایدی کۆکاین دەردەکرێت.



ئەم شێوە نوێ‌و بەهێزەی کۆکاین بوو بە کێشەیەکی گەورە لە ئەمریکا بۆ ئەوانەی کە لە نارچە هەژارنشینەکانی

نێوەندی شارەکاندا دەژیان و لەگەڵ خۆیدا گەردەلولێکی توندوتیژی و تاوانی بەدیاری بۆهێنان کە هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە. کێشەی تاوان و توندوتیژی کە لەئەنجامی بەکارهێنانی دەرمان و مادە هۆشبەرەکانەوە تەشەنەی سەند، بوو بە بنێشتەخۆشەی سەرزاری ڕۆژنامەکان. ئەگەرچی کراک هاوشان لەگەڵ بەرزبوونەوەی ڕادەی تاوان و توندوتیژیدا هاتە بەریتانیاوە بەڵام هەرگیز نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی ئەمریکا. ئێستا بەکارهێنانی کراک لەبەریتانیادا زۆر



پەرە لەزیادبییە بە تایبەتی لەنێو ئەو گەنجانەی کە سەرتاسەری شەو لە یانەکاندا سەمادەکەن.

کۆکاین و کراک لە مادە وریاکەرەوە هەرە بەهێزەکانن بەڵام کاریگەرییەکانیان کورتخایەنە. بەتایبەتی کراک زۆربەهێز و زۆر کورتخایەنە. بەکارهێنەرانی هەست بە وریای و بەهێزی دەکەن. زۆر لەبەکارهێنەران وتویانە کە دوای بەکارهێنانی ئەم دەرمانە هەستیان بە لەخۆڕازیبوون و چالاکی جەستەیی کردووە و لەو باوەڕەدابوون کە خاوەنی توانایەکی بەهێزی مێشکن. ئاسەوارە جەستەییە باوەکانی بریتین لە: دەم وشکی، ئارەقکردنەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن و بەرزبوونەوەی ڕادەی لێدانی دڵ و دەمار. دوای ژەمی گەورە بەکارهێنەران پێدەچێت هەست بە دڵەڕاوکێ و نائارامییەکی زۆر بکەن. کاریگەری هەڵمژینی کۆکاین بەخێرایی دەسپێدەکات بەڵام تەنها بۆ ماوەی 30 خولەک دەمێنێتەوە ئەگەر دووبارە نەکرێتەوە. ئەگەر ئەو کەسە کراک

بکێشێت ئەوا کاریگەرییەکانی تەنانەت لەوەش زووتر دەردەکەون بەڵام زۆر لەوەی پێشوو کەمتریش دەخایەنێت.

یەکێك لەبەکارهێنەران ئاوا باسیدەکات:

"وات لێدەکات هەست بە مەزنیو بەهێزیو هەرچی شتە بکەیت. کێشەکە لەوەدایە کە دەتوانێت بەتەواوی ئالودەو گیرۆدەت بکات. کاریگەرییەکەی ئەوەندە ناخایەنێتو ناچاریت جارێکی دیکەش بەکاریبهێنیتەوە. لەبەرئەوەیە من ئەوەندە بە بەربەریانەی دەزانمو سەرو سامانم تێناوە."[11]

ژەمی گەورەو نزیك نزیك لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا دەکرێت ببێتە هۆی دڵەڕاوکێیەکی زۆر زۆرو خانەگومانیو دڵپیسیو ڕەشبینیو تەنانەت هەلوەسەش. بەشێوەیەکی گشتی ئەم کاریگەریانە لەگەڵ دەرچونی دەرمانەکە لە لەشدا ئەوانیش دیارنامێنن. کاریگەرییە دواینەکانی کۆکاینو کراك لەوانەیە پەرێشانیو خەمۆکی بگرێتەوە کاتێك بەکارهێنەران دەرمانەکەیان دەست ناکەوێت یان بەکارناهێنن. کۆکاین لەگەڵ مادەی دیکەدا تێکەڵ دەکرێتو ئەمەش زۆر ترسناکە بۆ بەکارهێنانی لەڕێگەی دەرزییەوە.هەندێك چەندو چون هەیە لەسەر ئاسەواری ئاستی قبوڵکردنی لەشو نیشانەکانی کشانەوەو تەرککردن. لەکاتێدا ئەوە ڕاستە کە کۆکاینو کراك ئالودەگی جەستەییان وەك هیرۆین نییەو شتێکی چەواشەکارانەیە گەر وەك یەك پێناسەیان بکەینو بەپێی ئەو پێوەرە جەستەییانە پێوانەیان بکەین کە تایبەتن بە هیرۆین. هەر دەرمانە کاریگەری جەستەیی تایبەتی خۆی هەیەو سەبارەت بە کۆکاینو کراك زۆر زۆر بەهێزە. بەکارهێنەرانی

---

[11] Drug Scope [Online]

بەردەوامی کۆکاین و کراك زۆر خوو بە دەرمانەکەوە دەگرن و لەشێشیان زۆر لەگەڵیدا ڕادێت کە وایان لێدەکات وریاو بەکاربن کاتێك بەکاریدەهێنن و کوڵۆڵو دەستەپاچەو غەمگین بن کاتێك لێیان دەبڕێت یان بەکاریناهێنن" کەئەمە زۆر دوورو ئەستەمە بۆ بەکارهێنەرێکی بەردەوام یان ناوبەناویش. لەم بارەدا بەکارهێنەر تووشی بێخەوی و دابەزین و داتەپینێکی گەورەی جەستەیی و سۆزداری دەبێت. ئەمەش پێدەچێت لەشێوەی سکچوون، ڕشانەوە، لەرزین، ئارەزووی خۆراك نەخواردن لەترسی قەڵەوی (بەتایبەتی ژنان)و ئارەقکردنەوە کە ئەمانە لەهەندێك کەسدا لەسەرو تواناو ووزەوەن. زۆر لە بەکارهێنەران ئەم ئاسەوارانە دەزانن و لە پێناوی خۆپاراستن لێیان و نەکەوتنە نێو ڕۆنگاوی پەرێشانییەوە زۆر هەڵوێستە دەکەن لە بەکارهێنانیدا. ئەوەندەی کە پەیوەندی بە کراکەوە هەیە، زۆر کەس دەڵێن کە بەپێچەوانەی کۆکاینەوە زۆر ئالودەکەرەو بەکارهێنەران ناتوانن بەئاسانی دەستبەرداری ببن. زۆر لەبەکارهێنەران دەبن بە بەکارهێنەری ڕۆژانەو چەند مانگێکی دەوێت تا دەبنە ئالودەبوو، بەڵام زۆر کەسی دیکە لەو باوەڕەدان کە تەنها خوگرییە.

بۆ هەردوو کۆکاین و کراك خوگری و ئالودەبوون شتێکی دوورەدەست نییە. بەڵام ڕادەی خێرایی ڕودانەکەی بەپێی باری دەروونی بەکارهێنەرەکەو هەلومەرجەکەی دەگۆڕێت. ئەو ڕاستییەی کە کۆکاین و کراك گرانن ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەسانەی کە خویان پێوەدەگرن پارەیەکی زۆر زۆر سەرف دەکەن. ئەوانەی کە دەوڵەمەندنین پێدەچێت لە تاوان و لەشفرۆشییەوە بگلێن بۆ ئەوەی پارەی دەرمانەکەیان دەربهێنن.

بەکارهێنەرانی بەردەوام بەهۆی بێخەوی‌و دابەزینی کێشی لەشەوە تەواو دادەهێزرێن‌و تەواو دادەبەزن. بەردەوام هەڵمژینی کۆکاین دەبێتە هۆی تێکشکاندنی ئەو دیوارەی کە لوت دەکات بە دوو بەشەوە. بەردەوام کێشانی کراک دەبێتە هۆی گیروگرفت لە هەناسەداندا و لەدەستدانی دەنگ بەشێوەیەکی بەشی (جزئی). دەرزیلێدان بۆ ماوەی دوورودرێژ ڕەنگە ببێتە هۆی کۆبوونەوەی کێم‌و جەراعەت‌و هەوکردن لەگەڵ مەترسی زیاتری توشبوون بەنەخۆشی ترسناکی وەك ئایدز‌و زەردوویی (هیپەتایتس) ئەگەر دەرزییەکان لەنێوان چەند کەسێکدا بە هاوبەشی بەکاربهێنرێن.

ئەو ژنانەی کە لە ماوەی سکپڕیدا کۆکاین یان کراك زۆر بەکاردەهێنن پێدەچێت تووشی کێشە ببن‌و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کار بکاتە سەر کۆرپەکانیشیان. لە ڕۆژنامە ئەمریکییەکاندا زۆر لەسەر "کۆرپە کراکییەکان" ووتراوە، لەڕاستیدا زۆر منداڵی ئەو دایکانەی کە کراك بەکاردەهێنن نائارام‌و تۆقرەنەگرن‌و خۆراکیان خراپە بەلام ڕادەی بڵاوی ئەم دیاردەیە زیادەڕەوی‌و گەورەکردنی تێدایە.




لە بەریتانیا کراك بەزۆری لەلایەن ئەو گەنجانەوە بەکاردێت کە تەمەنیان لەنێوان 20-24 ساڵدایەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ برێکی زیاتری ئەم مادەیە لەلایەن

پۆلیسەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت. کراکو کۆکاین لەلایەنی یاساییەوە لە پۆلی A دان.

Alkyl Nitrites.4 یان کۆمەڵەی نیترێتەکان کە Amyl، Butyl وە Isobutyl nitrate دەگرنەوە شلەمەنییەکی ڕوونی زەردن کە بۆ مەبەستی کاریگەرییە مەستیبەخشەکانیان هەڵدەمژرێن.

لە بەریتانیا بەشێوەیەکی گشتی لەشێوەی شلەمەنییەکی ئاڵتونیدا دەفرۆشرێن لە بوتڵی بچوکدا. گەلێك ناوی بازرگانیو ناوبازاڕی هەیە لەوانە Ram ، Thrust، hard Rock، Kix، TNTو زێڕی شل. شلەمەنییەکە یان ڕاستەوخۆ لە بوتڵەکەوە یان لە پارچە قوماشێکەوە هەڵدەمژرێت. نیترێتەکان لە بنەڕەتدا لە شێوەی کەپسولی بچوکی شوشەدا هاتن کە لەکاتی هەڵپچڕیندا تەقەیەکیان لێوەدەهات. ئەمەش وای کرد کە نیترێتەکان ناوبنێن Poppers واتە تەقیوەکان یان تەقێنەرەوەکان (بۆ شتی بچوکی وەك میزەڵان ... هتد). نیترێتەکان لەکاتی هەڵپچڕیندا بۆنێکی خۆشیان لێدێت، بەڵام پاش ماوەیەك بۆگەن دەکاتو بۆنەکەی دەگۆڕێت بۆ بۆنی "گۆرەوی پیسو بۆگەن"!

تا ئێستاش لە بەریتانیا Butyl nitrite لە دوکانی فرۆشتنی شمەکە سێکسییەکانو بارەکانو یانە شەوانەکانو هەندێك جار لە دوکانی جگەرە فرۆشو پۆشاکیشدا دەفرۆشرێن بوتڵی بە 5 پاوەند.[12]

ئەمایل نایترێت یەکەمجار لە ساڵی 1857 دا دۆزرایەوەو بۆ چارەسەرکردنی ئازاری سنگ Angina بەکار دەهات. لەو ساڵانەی دوایدا

---

[12] Drug Scope [online]

بە دەرمانی دیکە شوێنی گیرایەوەو تاکە بەکارهێنانێکی پزیشکی ئێستای ئەو دەرمانە وەك چارەسەرێك بۆ ژاراوی بوون بە سیانید بەکاردێت.

نایتریتەکان لە سالآنی 1950 کاندا لە نمایشەکاندا بەکاردەهاتن‌و لە 1960کانیشدا لە ئەمریکا وەك دەرمانی سەرجادە بەکاردەهاتن. Butyl Nitrite هیچ کەلکێکی پزیشکی نییەو لە بنەڕەتدا وەك بۆنخۆشکەرو بۆنبڕی ناومالٚ بەکارهاتووە لە ئەمریکا. ئەو دەرمانە لە شانشینی یەکگرتوو یەکەمجار لە یانەو دیسکۆکاندا بەکارهات لە سالآنی 1970کانداو دواتریش لە یانەی سەمادا لە سالآنی 1980کان‌و 1990ەکاندا.

کاریگەرییەکانی یەکسەر دوای هەلٚمژینی دەردەکەون بەلآم تەنها بۆ ماوەی چەند خولەکێکی کەم دەمێننەوە. بەکارهێنەران هەست بە خێرایی دەکەن چونکە لێدانی دلٚ خێرادەبێت‌و خوێن بەپەلە بەرەو سەر ووروژم دەبات. سەرێەشەیەکی بەهێزو کوتوپڕ (سەرت زریکەی دێت)، سەرگێژخواردن، خەوالٚویی، هەستکردن بەوەی کە کات هێواش بووەتەوە، سورهەلٚگەڕانی دەموچاوو مل‌و هەستکردن بەوەی کە بەتەواوی کۆنترۆلٚ ناکەیت بەسەر هۆش‌و کردارو ڕەفتارتدا لە نیشانە باوەکانی بەکارهێنانی ئەم دەرمانەن. ئەو کەسانەی کە نایتریت بە مەبەستی خۆشی سێکسی بەکاردەهێنن ووتویانە هەست بە ماوەیەکی زۆرتری خۆشی ئاوهاتنەوە Orgasm دەکەن‌و ناهێلٚێت پێش وەخت تەواوبن، ئەگەرچی هەندێك پیاو ووتویانە دوای ئەوە کێشەی ڕەپبوونیان هەبووەو نەیانتوانیوە بەدەستیبهێنن. ئەم دەرمانە لەلایەن ئەوانەشەوە زۆر بەکاردێت کە هاوسێکسن Homosuxalsو مەترسییەکی دیکە ئەوەیە کە بەهۆی سەرخۆشییەوە ناتوانن ڕێوشوێنی

سەلامەتی سێکسی پەیڕەو بکەن و دەکەونە مەترسی توشبوون بە نەخۆشی ئایدزەوە HIV.

بەکارهێنەران پێدەچێت ببوورێنەوە ئەگەر دوای ئەوە خەریکی چالاکی جەستەیی بەهێزبن وەك سەماکردن و ڕاکردن. بەکارهێنانی نایتریت بووەتە هۆی دڵەکوتێ لەکاتێکدا کە بەکارهێنەر خۆی لەخۆیدا پەستانی بەرزی خوێن یان کێشەی دڵی هەبوبێت. تەنانەت بووەتە هۆی مردنیش لەکاتێکدا کە خەڵك نایتریتیان خواردۆتەوە لەباتی هەڵمژینی بۆنەکەی. هەروەها نایتریت پەستان لەسەر چاویش زیاد دەکات و بەتایبەت بۆ ئەوانە زۆر ترسناکە کە نەخۆشی چاوی وەك گلاوکۆمایان هەیە glaucoma.

زۆرجار نیتریتەکان لەگەڵ دەرمانی دیکەدا بەکاردێن بۆ بەهێزکردنی کاریگەری دەرمانەکە بەڵام هەر تێکەڵکردنێکی دەرمان ترسناکەو لەوانەیە ببێتە هۆی دەرئەنجامی چاوەڕوان نەکراو.

بەکارهێنانی بەردەوامی ئەم دەرمانە پێدەچێت ببێتە هۆی نەخۆشی پێست لەدەورووبەری لوت و لێو. هەروەها بەکارهێنەرانی بەردەوام لەشیان لەگەڵیدا ڕادێت و هەڵمژینی نایتریت ئەو ئەنجامەی پێشو نادات بەدەستەوەو پێویستییان بە بڕی زیاترە بۆ بەدەستهێنانی. بەکارهێنانی بەردەوامی پێدەچێت ببێتە هۆی خوگرییەکی سایکۆلۆژی بە دەرمانەکەوە بەڵام هیچ بەڵگەیەك لەبەردەستدا نییە کە ببێتە هۆی ئالودەگی جەستەیی و نیشانەکانی دوای کشانەوەو تەرککردن نەبینراون.

هەندێك کەس بەکارهێنانی نایتریتەکانیان بە هۆکاری جۆرێك شێرپەنجە لەقەڵەمداوە کە زۆر دەگمەنەو پێیدەڵێن: Kaposi's sarcoma کە

یەکێکە لە نیشانە سەرەتاییەکانی ئایدز لەو پیاوانەدا کە هاوسێکسن و تووشی ئایدز بوون. بەڵام لەگەڵئەوەشدا بەڵگەی ئەو پەیوەندییە تا ئێستا نەسەلمێنراوە.[13] لەلایەنی یاساییەوە ئەم دەرمانە تا ئێستا لە بەریتانیا بە دەرمانی نایاسایی ناوزەدنەکراوەو فرۆشتن و هەڵگرتنی کۆنترۆڵ نەکراوە. لەگەڵئەوەشدا بەپێی ئاژانسی کۆنترۆڵکردنی دەرمان و بەڕێوەبەرێتی یەکێتی ئەورووپا هەر مادەیەك کە بفرۆشرێت و کاریگەری سایکۆلۆژی یان ڕەفتاری هەبێت لەسەر خەڵك پێویستە وەك دەرمان مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و یاسای کۆنترۆڵکردنی دەرمان بیگرێتەوە بەبێ گوێدانە شێوەی فرۆشتنی.

5.کافاین Caffeine: کافاین دەرمانێکە لە چا، قاوە، Cocoa، گەلێك خواردنەوەی سوکی وەك کۆلاو گەلێك چۆکلێتدا دەبینرێتەوە. هەروەها لەگەڵێك دەرمانیشدا بەکاردێت بەتایبەتی ئەو دەرمانانەی کە بۆ چارەسەرکردنی سەرمابوون بەکاردێن. کافاین دەکرێت بەشێوەیەکی دەستکرد لە تاقیگەکاندا دروستبکرێت بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لە دەوەنی قاوەی عەرەبی، گیای چای بازرگانی، دەنکی



[13] Ibid

Cocoaو بەری کۆلا دەردەهێنرێت. قاوە لەگەڵێك شوێنی ئەم جیهانە دەڕوێت وەك ئەفریکا، نیمچە دورگەی عەرەب، ئەمریکای ناوەندو باشور، جاوەو سامارتاو ناوچە هیندییە خۆرئاواییەکان (ئەمریکا). چا بەشێوەیەکی سەرەکی لە خۆرهەڵاتی ئاسیاو ئەمریکای باشور دەڕوێت بەتایبەتی هیند، چین، ئەندەنوسیا، سریلانکاو یابان. زۆربەی Cocoa ی جیهان لە خۆرئاوای ئەفریکا بەرهەمدێت.

وەك پێشتر باسکرا چا مێژوویەکی دێرینی هەیە بەڵام قاوە نوێترە. کافاین کە لەهەموو ئەو بەرهەمانەدا دەبینرێتەوە وریاکەرەوەیەو لەش گورجوگۆڵ دەکاتەوەو لێدانی دڵ زیاد دەکاتو پەستانی خوێنیش بەرز دەکاتەوە. ماندویەتی دەحەوێنێتەوەو خەواڵویی دەڕەوێنێتو وا لە خەڵك دەکات زیاتر وشیار بنو باشتر مێشکیان چەقببەستێت. خەڵکانێکی زۆر لە سەرتاسەری جیهاندا بەیانیان کوپێك چا یان قاوە دەخۆنەوە بۆ ئەوەی بکەونە گەڕ! هەروەها خەڵك چاو قاوە دەخۆنەوە بۆ ئەوەی بحەوێنەوە دوای کارکردن.



کافاین یارمەتی میزکردنی زیاتریش دەدات. ئەگەر بەبڕی زۆر بخورێتەوە دەبێتە هۆی سەریەشەو پەشێوی.

ئەو کەسانەی کە لە ڕۆژێکدا زیاتر لە 6-8 کوپ چاو قاوە دەخۆنەوە بە خەستییە مامناوەندی خوی پێوەدەگرن. لەوانەی زۆر سەخت بێت بۆیان واز لێبهێننو

كاتێك نەیخۆنەوە هەست بە ئاسەوارەكانی پاشكشەو تەرككردن دەكەن. ئەمەش هەست بە ماندویی كردنو دڵەڕلوكێو سەریەشە دەگرێتەوە.

ئەو توێژینەوانەی كە لەسەر كافاین كراون یەكلاكەرەوە نین. هەندێك لە لێكۆڵینەوەكان كاریگەرییەكانی بە خراپ باسدەكەنو هەندێكی دیكەشیان بە شێوەیەكی هێواشتر. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك راپۆرت ئەوەیان دەرخستووە كە ئەگەری توشبوون بە ڕەبوو، زامداربوونی گەدە زیاد دەكاتو دەبێتە هۆی توشبوونی زیاتر بە نەخۆشییەكانی گورچیلە، میزەڵان وە نەخۆشییەكانی دڵو كێشەكانی زیادبوونی فشاری خوێن.



مەترسی كافاین بۆ منداڵ گەلێك زیاترە. منداڵان لە زۆر وڵات هەر لە منداڵییەوە چاو قاوەیان دەدەنێ زۆر جار وەك یارمەتیدەرێك بۆ تێربوون لەكاتی كەمی شیردا. ئەم دیاردەیە لە وڵاتە هەژارەكاندا زۆر بڵاوە. لە وڵاتە پیشەسازییەكانیشدا منداڵان بڕێكی زۆر كافاین وەردەگرن لە چوكلێتو خواردنەوە گازییەكاندا ئەو منداڵانەی كە بڕێكی زۆر كافاین دەخۆن زۆر بزێوو نائارام دەبینرێن. ئەو منداڵەی كە قوتویەك كۆكا كۆلا دەخواتەوە ئەوەندەی گەورەیەك كە چوار كوپ قاوەی خواردۆتەوە كافاینی وەرگرتووە.[14] كوپێك چای ئاسایی (بەپێوەری ئەوروپییەكان) 40 میلیگرام كافاینی تێدایە بەڵام كوپێك قاوە 60 ملگم كافاینی تێدایە. دیارە ئەوەش بەپێی خەستیو ڕوونیو ڕادەی كوڵاندنیان زۆر دەگۆڕێت.

---

[14] **Drug Scope [online]**

گەلێك جۆر قاوەو چا هەیەو لە ناوچە جیاجیاکانی جیهاندا بەگەلێك شێوەی لێکجیاواز دەخورێنەوە. لە کوردستان ئەوەی کە لەمێژەوە بووە بەبەشێك لە کولتورو ژیانی ڕۆژانەو کۆڕی شەوانە ئەو جۆرە چایەیە کە بە چای ڕەش ناسراوە. لە هەندێك ناوچە زۆر بە خەستی دەخورێتەوە (بەتایبەتی لە گوندەکاندا)و زۆریش دەکولێت. پیاوان، بەتایبەت دوای ڕۆژی کاری گران‌و لەکاتی کارکردنیشدا بڕێکی زۆر چا دەخۆنەوە. دیارە ئەمەش بێجگە لە هۆکارە سەرەکییەکانی ڕۆڵی کافاین لە ووریاکردنەوەو چالاککردنیاندا هۆکاری ئابوریشی هەیە" وەك تاکە شلەمەنییەك کە لەبەردەستدا بێت، بەهۆی گرانی‌و کەمی جۆرەکانی دیکەی خواردنەوەی ئاوی میوەو شەربەت وەکو جێگرەوەیەك بۆ ئەو ئاوەی کە بەردەوام لەلەشیان دەردەچێت. لەزۆربەی کوردستاندا خەڵکانێکی ئەوتۆ دەبینین کە ئەگەر ڕۆژێك چا نەخۆنەوە هەست بە هەموو ئاسەوارەکانی پاشەکشەو داهێزران دەکەن‌و ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە کافاین بۆ ئەو جۆرە کەسانە بووە بە خووگری‌و تەنانەت دەتوانین بڵێین ئالودەگیش.

کافاین وەك دەرمانێکی کۆنترۆڵکراو نەناسرلوەو یاسا هیچ جۆرە سنورێکی بۆ دانەناوە لەشێوەی چاو قاوەو چۆکلێت‌و خواردنەوە گازییەکاندا بەڵام ئەو دەرمانە پزیشکیانەی کە کافاینیان تێدایە بەبێ مۆڵەتی پزیشك نافرۆشرێن. پزیشك‌و شارەزایانی تەندروستی هۆشداری دەدەن لەسەر مەترسییەکانی زۆر بەکارهێنانی کافاین‌و ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن بۆ سنوردانان بۆی.

ئەو چا یان قاوەیەی کە دەیخۆینەوە نەهێڵین زۆر بکولێت یان تەواو قوڵپ بدات‌و خۆمان وا ڕابهێنین کە ڕوونتر بیخۆینەوەو ئەگەر بگونجێت لەگەڵ

شیردا تێکەڵی بکەین (وەك خۆرناواییەکان)و لە شەوو ڕۆژێکیشدا نەگاتە 6-8 کوپ، پێدەچێت زۆر لەمەترسییەکانی کەمبکاتەوە. ئەوەندەی پەیوەندی بە منداڵانەوە هەیە، بەتایبەتی منداڵانی بچوك‌و ساوا، ئەوا باشترین ڕێگا فێرنەکردنیانە بۆڕێگرتن لە خوگری بە کافاینەوەو دواتریش لەتەمەنی گەورەتردا سنوورداناى بۆی.

6. جگەرە (توتن) Tobacco: توتن گەڵای وشککراوەی ئەو گیایەیە کە لەگەلێك شوێنی ئەم جیهانە دەڕوێنرێت. جگەرە زیاتر لە 4000 مادەی کیمیاوی تیدایە، بە مادەی ژارلوی وەك ئەمۆنیاشەوە، بەلام تاوانباری سەرەکی لە جگەرەدا نیکۆتینە" ئەو دەرمانە ئالودەکەرە بەهێزە.[11]



وشەی توتن‌و نیکۆتین کە بە لاتینی پێیان دەوترێت nicotiana tabacum بەو پووەکە ووتراوە کە کۆلۆمبس لە گەشتەکەیدا بۆ ئەمریکا لەگەڵ خۆی هێنایەوە. ئیسپانییەکان پێیان ووت تەباکۆ Tabaco وە ئینگلیزەکان کردیان بە تۆباکۆ Tobaccoو

[15] Real News About Drugs and Your Body. [online]

بەکوردیش پێیدەڵێن توتن یان وەك لەهەندێك ناوچەی کوردستان دەڵێن تۆماکۆو عەرەبەکانیش پێی دەڵێن تبغ ئەگەرچی لە زمانی ئاخاوتندا هەر توتنە. بنچینەی ئەو وشەیە ڕوون نییە بەلام پێدەچێت لە وشەی تەباگۆ Tabago داتاشرابێت کە ئەمریکییە ڕەسەنەکان بۆ دارجگەرەیەکی شێوەی پیتی Yی بەکاریان هێناوە کە بۆ هەڵمژینی تۆزی توتن کەڵکیان لێوەرگرتووە.

لە ساڵی 1601دا توتن گەیشتە ئیمپراتۆریەی عوسمانیو جگەرەکێشان بە خێرایی بڵاوبووەوە ئەگەرچی پیاوانی ئاینی نارەزایی بوون.[16] لەساڵی 1633 دا سولتان موڕادی چوارەم بڕیاری لەسێدارەدانی دەرکرد بۆ جگەرەکێشەکانو واباسدەکرێت کە ڕۆژانە 18 کەس لەسێدارەدرابن![17] پێدەچێت ئەو قەدەغەکردنە توندوتیژە هۆکاری سیاسیو ئابوری هەبووبێتو سولتان بە مەترسییەکی زانیبێت بۆ کەمبوونەوەی دەسەلاتیو زاڵبوونی کولتوری ئەوروپییەکان بەسەر هزری خەڵکیدا. لە ساڵی 1647دا ئەو یاساخییە لەسەر توتن لابراو وەك ئیبراهیم پێسیڤی مێژوونوس دەڵێت: "بەمجۆرە جگەرەش چووە ڕیزی قاوەو مەیو تلیاکەوە وەك یەکێك لەو چوار گۆشەیەی کە لەسەر قەنەفەی ڕابواردن پاڵیانپێوەدراوە."[18] ئێستاکە زانیارییەکی دروستم لەبەردەستدا نییە کە توتنو جگەرە کەی گەیشتونەتە کوردستان. ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە لەگەڵ پەرەسەندنی ئیمپریالیزمدا توتن لەلایەن ئەوروپییەکانەوە بە سەرتاسەری جیهاندا بڵاوبووەتەوە، بەلام

[16] History Net- The History of Tobacco part 1 (to 1676) [online]
[17] Ibid
[18] Ibid

ئایا تورکەکان گەیاندویانەتە کوردستان یان ئینگلیزەکان یان کەسێکی دیکە؟ ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە لە کوردستاندا بەخێرایی بڵاوبووەتەوەو ژمارەیەکی زۆر خەڵك پێوەی گیرۆدە بوون. جگەرە لەو سەردەمەدا لەکوردستان لەدوای چا دووەم مادەیە کە لەلایەن جەماوەرێکی فراوانەوە قبوڵبکرێتو نە ئاینو نە کولتور نەبنە هیچ بەرگرێك لەبەردەمیدا کە هیچ نەبێت سنورداری بکەنەوە. شایانی باسە کە هەندێك لە لایەنە ئیسلامییەکان لەمدواییەدا بانگەشەی بە حەرامناساندنی جگەرەیان کردوو لەنێو کۆڕو کۆمەڵانی خەڵکیشدا ڕادەی قبوڵکردنی زۆر دابەزیوە. نابێت ئەوەشمان لەبیربچێت کە تا ساڵانی 1960ەکان لە ئەوروپاش هیچ جۆرە مەترسییەکی تەندروستی جگەرە نەزانرابوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە جگەرە بە هۆکارێکی تەندروستی باشو حەوانەوە ناسرابوو وەرزشەوانە بەنێوبانگەکان بانگەشیان بۆ دەکرد.[19]



تووتن بەگەلێك شێوە بەکاردێت: وەك جگەرەی پێچراوە دەکێشرێت، لەنێو سەبیل (قەنە) Pipe دا، بە دارجگەرە، لەشێوەی سیگاردا دەپێچرێتەوە، لەڕێگای نێرگەلەوە دەکێشرێت، لەهەندێك شوێن

[19] Drug Scope [online]

لەڕێگای لوتەوە هەڵدەمژرێت‌و هەروەها گەڵاکانی بەتەڕی دەجورێت.[20]

سەرباری ئەو ڕێگایانەش لەگەڵ کانەبیس (حەشیش) تێکەڵی دەکەن‌و پێکەوە دەیانکێشن.

بەگوێرەی ئاماری ساڵی 2001 لە ئینگلتەرە 27٪ ی ئەو کەسە پێگەیشتوانەی کە تەمەنیان لە 16 ساڵ بەرەو ژوورە جگەرەیان کێشاوە" 28٪ پیاوبوون‌و 25٪ ژن. بەپێی ئاماری ساڵی 2002 10٪ ی ئەو منداڵانەی کەتەمەنیان لە نێوان 11-15 ساڵاندایە



جگەرەیان کێشاوە بەبەردەوامی 9٪ کوڕ بوون‌و 11٪ کچ. لە ساڵی 1995 دا زیاتر لە 120000 کەس بەهۆی جگەرەوە مردون، کە دەکاتە یەك لەسەر پێنجی هەموو مردووەکان. لە ساڵی 2002-2003 دا لە UK 54737 ملیۆن جگەرە کەوتۆتە بازاڕەوە بۆ بەکارهێنان 48606 ملیۆنی بەرهەمی ناوخۆ بووەو 6132 ملیۆنیشی هاوردە بووە لە دەرەوە.[21] ئەمە بێجگە لەو بڕە جگەرەیەی کە بە قاچاخ دێتە نێو وڵاتەوە. جگەرەکێشان دەبێتە هۆی هەڵمژینی قەتران Tar، نیکۆتین، کاربۆن مۆنۆکسایدو چەندەها گازی دیکە.

[20] Stop Drugs. Org- Tobacco [online]
[21] Drug Scope [online]

نیکۆتین دەرمانێکی ووریاکەرەوەیە کە دەبێتە هۆی زیادبوونی ڕادەی لێدانی دڵو بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

ئەوانەی کە بەبەردەوامی جگەرە دەکێشن وا هەستدەکەن کە جگەرە خەمو خەفەت بەبادەداو دڵەڕاوکێو فشاری ژیان لەبیردەباتەوەو چەقبەستنی مێشك باشتر دەکاتو بێزاری ناهێڵێت. هەندێك کەس دەڵێن ئارەزووی خواردنیان کەمدەکاتەوە. ئەوانەی کە بۆ یەکەمینجار جگەرە دەکێشن بەزۆری هەست بە بێتاقەتیو سەرگێژخواردن دەکەنو تووشی سەریەشە دەبن.

لەش بەزوویی لەگەڵ نیکۆتین ڕادێتو بەمجۆرە بەردەوام پێویستت بەبڕی زیاترە بۆ ئەوەی وەك پێشوو کاریگەربێت. زۆربەی ئەوانەی کە جگەرەکێشن ئالودەی دەبنو هەست بە بێئارامیو بێتاقەتی دەکەن ئەگەر بیانەوێت وازیلێبهێنن. لەوانەی کە جگەرە کێشن خەڵکانێکی کەم هەن کە دەتوانن هەر جاروبار جگەرە بکێشنو ڕۆژانە ژمارەیەکی دیاریکراو بکێشن یان هەر نەیکێشن.

خوگری بە جگەرەکێشانەوە تەنها مشتێکە لە خەرواری ئەو مەترسیانەی کە بەهۆی جگەرەکێشانەوە توشمان دەبن. کاتێك ئەو دوکەڵە هەڵدەمژیت بەخۆیو هەموو ئەو مادە کیمیاویانەوە کە هەڵیگرتووە، لەلایەن سییەکانەوە هەڵدەمژرێتو بەخێرایی دەچێتە نێو سوڕی خوێنەوە، کاتێك دەکەونە نێو ئەو سوڕەوە لە دڵەوە بۆ مێشکتو سەرتاپای لەشت دەگوێزرێنەوە. سییەکانت پڕدەبن لە پاشماوەی مادەی کیمیاوی. جگەرەکێشانی بەردەوامو بۆ ماوەی دوورودرێژ ئەگەری مەترسی تووشبوون بە چەندەها نەخۆشی

کوشندە زیاددەکات وەك شێرپەنجەی سیو جۆرەکانی دیکەی شێرپەنجە، نەخۆشییەکانی دڵ، نەخۆشی ڕێچکەکانی هەوا Bronchitis ، خراپی سوڕی خوێنو زامداربوونی گەدە. ساڵانە تەنها لە UK دا 120000 کەس دەمرن بەهۆی ئەو نەخۆشییانەوە کە بەهۆی جگەرەوە توشیدەبن.[22]

لەگەڵ هەر مژدانێك لە جگەرەکەت نیکۆتین دەستێك دەوەشێنێت لە شێوەی کارکردنی مێشکت. هەر وەکو هیرۆینو کۆکاین، نیکۆتین ڕژانی مادەیەکی کیمیاوی دەوروژێنێت کە پێیدەڵێن دۆپامین، کە دەکەوێتە ئەو شوێنانەی مێشکەوە کە پەیوەندییان بە هەڵسوکەوتی خوگریو ئالودەگییەوە هەیە. بێگومان ئەوەی کەسێکی جگەرەکێش وەری دەگرێت ئەوەندەی ئەوە نییە کە لە دەرمانەکانی وەك هیرۆینو کۆکاینەوە وەردەگیرێت، بەڵام وریابەو مەکەوەرە هەڵەوە: نیکۆتین دەرمانەو کار لەمێشکت دەکات.[23]

توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە نیکۆتین بەشێوەیەکی تایبەت بۆ گەشەکردنی دڵ، سییەکانو مێشکی هەرزەکاران زیانبەخشەو هەتا گەنجتربی کە دەستدەدەیتە جگەرەکێشان ئەگەری توشبوونت زیاترە بە نەخۆشییە کوژەرەکان.

دوکتۆر سیندی ماینەر سەرۆکی بەشی بڕیاردانی پەیمانگای نیشتمانی لەمەڕ خراپ بەکارهێنانی دەرمان NIDA لە ئەمریکا دەڵێت: **"تا گەنجتربی کاتێك ئالودە دەبیت مانای ئەوەیە جگەرەی زیاتر**

[22] Drug Scope [online]
[23] Real News About Drugs and Your Body [online]

**دەکێشیت لە ژیانتدا. تا جگەرەی زیاتریش بکێشیت... چاکە، ئێمە دەزانین ئەوە بەرەو کوێت دەبات"**[24]

ئەو ژنانەی کە لەکاتی سکپڕیدا جگەرە دەکێشن پێدەچێت منداڵی کێش سوکتریان ببێت لە ڕادەی ئاسایی.

بێجگە لەوەش جگەرەکێشان لەکاتی خواردنی حەبی بەرگرتن لە سکپڕی ئەگەری نەخۆشییەکانی دڵو سوڕی خوێن زیاد دەکات.

لەڕاستیدا هیچ بیانویەکی تەندروستی نییە بۆ جگەرەکێشانو جگەرە هیچ سونێکی تەندروستی تێدا نییە. جگەرەکێشان بەهەرشێوەیەك بێت هەرزیانی خۆی هەیەو ئەوانەی کە لەوپاوەڕەدان نێرگەلە Hookah بێزیانە پێدەچێت کەوتبنە هەڵەوە.




[24] Real news About Drugs and Your Body [online]

نێرگەلە ئامێرێکی جگەرەکێشانە کە لەوێدا تووتنەکە بەهۆی خەڵوزەوە گەرمدەکرێت‌و دەسووتێنرێت‌و دوکەڵەکەی بەنێو بۆرییەکدا تێدەپەڕێت بەرەو نێو خانەیەکی پڕ لە ئاو، بەمجۆرە دوکەڵەکە سارد دەبێتەوە بەر لەوەی بگاتە جگەرە کێشەکە.

هەندێك لە بەکارهێنەرانی نێرگەلە لەو باوەڕەدان کە دوکەڵی نێرگەلە پاڵاوتەو خاوێنەو یان لانی کەم کەمتر قەتران‌و نیکۆتینی تێدایەو بەمجۆرە مەترسییە ناسراوەکانی جگەرەکێشانی سڕیوەتەوە یان کەمکردۆتەوە. نێرگەلە سەدان ساڵ لەمەوبەر لە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەندا بەکارهاتووە بەتایبەتی لەلایەن پیاوانەوە لە چایخانەکاندا. ئەم دیاردەیە لە وڵاتە عەرەبییەکاندا زۆر برەوی هەبوو. چەند دەیەیەك لەمەوبەر ئەو دیاردەیە زۆر کەمبووەو تەنانەت بەرەو نەمانیش دەچوو" تەنها پیرەکان بەکاریان دەهێنا لە چایخانە کۆن‌و



لاکۆڵانەکاندا. لە کۆتایی سالانی 1990 ەکاندا دیاردەی نێرگەلە جارێکی دیکە هاتەوە مەیدانو ئەمجارە چینی گەنجانو چینە ناوەندەکانی گرتەوەو بەرەو ئەورووپاو ئەمریکاش کشا، بەتایبەتی لەنێو عەرەبەکانی تاراوگەدا. ئەم دیاردەیە کوردستانی خۆمانیشی لێبێبەش نەبوو بەڵکو بە خێرایی بڵاوبووەوە نەك هەر لە نیشتمان بەڵکو لەنێو کوردەکانی تاراوگەشدا.

لەکاتێکدا کە ئەو دیاردەیە لە ئەمریکا برەوی سەند لیژنەیەك لە زانکۆکانی ڤێرجینیا، خوێندنگای پزیشکی ئەلیپۆو زانکۆی مێمفیس پێکهێنرا بۆ لێکۆڵینەوە لە کاریگەرییەکانی لەسەر مرۆڤ. لیژنەکە ڕوی کردە سوریاو لەوێ ڕوپێوی خۆیان دەستپێکرد لەسەر بەکارهێنەرانی نێرگەلە.

دوکتۆر تۆماس ئایسنبێرگ کە یەکێك بوو لە نوسەرانی ئەو لێکۆڵینەوەیە بەم جۆرە هاتە پەیڤین" نێرگەلە پێدەچێت پەیوەندی هەبێت بە مەترسی جیددی تەندروستییەوە، ئێمە هێشتا لەسەرەتای کۆکردنەوەی زانیاریدلین لەوبارەیەوە".

هەروەها ئایسنبێرگ دەڵێت:

" لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان لەسەر نێرگەلە ئەوەدەردەخەن کە ئەو ئامێرە ڕادەی مەترسییەکانی کاربۆن دایۆکسایدو نیکۆتین بەرزدەکاتەوەو لێدانی دڵ خێراتر دەکاتو ئەگەری توشبوون بە نەخۆشییەکانی بۆرییەکانی خوێن لەدڵدا زیاد دەکاتو دەبێتە هۆی چەندەها جۆر شێرپەنجە. نابێت ئەوەمان لەبیربچێت کە نێرگەلە تەنها هۆکارێکی دیکەی جگەرەکێشانەو هیچیتر، ئەزمونەکانی ڕابوردوو فێریانکردووین کە پشتگوێخستنی کاریگەرییە تەندروستییەکانی

**بـەکارهێنانی بەرهەمـەکانی تـوتن دەتوانێـت ببێتـە هـۆی قـەومانی کارەسـاتێکی تەندروسـتی جـەماوەری کـە پێدەچێت لـەکاتی خۆیـدا بکرایە بەریلێبگیرێت "**[25]

شایانی باسە بـەکارهێنانی نێرگەلـە نـەك هـەر ناتوانێت بـەر لـە نیکۆتین و قـەتران بگرێـت، چـونکە ئـەو مادانـە بـە نێـو ئـاودا گـوزەر دەکـەن بـەڵکو خێراتریش دەیانگەیەنێتە مێشك بەهۆی مژی بەهێزەوەو مەترسی کاربۆن




[25] Medical Research news- News Medical.net (2004) [online]

دایۆکسایدی خەڵوزەکەش نەك هەر بۆ ئەوکەسە زیاد دەکات کە دەیکێشێت بەڵکو بۆ ئەوانەش کە لەو شوێنەدا دەژین. لەلایەکی دیکەشەوە بەکارهێنانی نێرگەلە ئەگەری تێکەڵاوکردنی دەرمان و مادە هۆشبەرەکانی دیکە زیاتر دەکات و مەترسی تێکەڵاوکردنی چەند مادەیەکیش زیاد دەکات کە پێکەوە پێدەچێت بەرهەمێکی زۆر ترسناك پێکبهێنن.

ئەو رێنەیەی خوارەوە تەندروستی لەشی کەسێکی جگەرەکێش کەسێکی ئاسایی بەرانبەردەکات:

توێژینەوە نوێکان ئەوەیان دەرخستووە کە جگەرەکێشان زیانێکی زۆر دەگەیەنێت بەو کەسانەی کە جگەرە ناکێشن بەڵام هەمان هەوای پردوکەڵ هەڵدەمژن. ئێستاکە بەتەواوی لە بەڵگەی نوسراودا سەلماوە کە جەماوەرێکی فراوان دەکەونە بەر مەترسی کاریگەرییەکانی جگەرەکێشانی ناڕاستەوخۆ، کە لە حەساسییەتەکانی کۆئەندامی هەناسەدانەوە بیگرە تا دەگاتە هەوکردن و ڕەبوو (بەتایبەتی لە منداڵدا) و تادەگاتە شێرپەنجە هەمووی دەگرێتەوە.

بەگوێرەی ئاماری هەڵوێست بەرانبەر جگەرە کێشان و تەندروستی UK ‹ASH› ساڵانە نزیکەی 600 کەس لەوانەی کە بەهۆی شێرپەنجەی ... سییەکانەوە دەمرن و هەروەها دەوروبەری 12000 کەس کە بەهۆی نەخۆشییەکانی

دڵەوە دەمرن‌و هەموویشیان لەوانەن کە جگەرە ناکێشن، پێدەچێت هۆکاری توشبوونەکانیان بەو نەخۆشیانە هەڵمژینی ناڕاستەوخۆی دوکەڵی جگەرە بێت.[26] ئەو مەترسیانە بوونە هۆی قەدەغەکردنی جگەرەکێشان لە شوێنە گشتییەکاندا لە زۆر شوێن وەك لە ئیرلەندا، نەرویج، نیوزیلەندو سوید کە ئەو قەدەغەکردنە خواردنگاو باڕەکانیش دەگرێتەوە شایانی باسە ئەم پرۆسەیە نوێیەو لە سالی 2004دا خراوەتەگەڕ. لە UK سەرۆکانی هەر 13 کۆلیژە پزیشکییە شاهانەکان‌و جەماوەرو ڕێکخراوی زۆر پێشنیاری قۆرخکردنێکی هاوشێوەی ئەو ولاتانەیان کردووە بەلام تا ئێستا نەبووەتە یاسا. هەڵمژینی دوکەڵی جگەرەی خەڵکانی دیکە جگەرەکێشانێکی نائارەزومەندانەو ناشارستانیانەیەو نەك هەر یاسا بەلکو خەڵکی کۆمەڵگای مەدەنی خۆیان پێویستە بیرێکی لێبکەنەوە.

لەکوردستان جاران جگەرەکێشان لە کۆڕو کۆبوونەوەی خێزانی‌و بۆنەو ئاهەنگو دیدارە شادو ماتەمینییەکان‌و نێو پاس‌و دوکان‌و بازاڕەکان زۆر شتێکی ئاسای بوو. لە بۆنەو جەژنەکاندا تەنانەت ڕێگا بە مندالانیش دەدرا وەکو پیاوان جگەرەبکێشن. هەڵوێست لە کوردستان لەم سالانەی دواییدا زۆر گۆڕانکاری بەسەردا هات‌و چەندەها دەنگ بەرزبوەوە بەرانبەر هەڵمژینی دوکەڵی جگەرەی نائارەزوومەندانەی خەڵکانی دیکە. چیتر لە پرسەو جەژنەکاندا پێشکەش بە میوان ناکرێت‌و ئەوەندەی من ئاگادارم ئێستا لە نێو پاس‌و شوێنە گشتییەکانیشدا زۆر کەمبوەتەوە بەبەرانبەرکردن لەگەڵ

---

[26] ASH-Action On Smoking and Health, Basic Facts One, January 2003.

جاراندا. ئەو ڕێگایەی کە خەڵك خۆیان یاساو ڕێسای ژیان بۆ خۆیان دەستنیشان بکەن، لەکوردستاندا لە زۆر بواردا گەشەی کردووە" بەپێ زانستی کریمینۆلۆجی سەردەمیش باشترین ڕێگایە بۆ بەرەنگاربوونەوەی تاوان و دیاردە ناکۆمەڵایەتیەکان .

لەلایەنی یاساییەوە لە UK قەدەغەنییە جگەرە بکڕیت یان پێت بێت یان بیکێشیت. فرۆشتنی جگەرە بە منداڵانی تەمەن لە 16 ساڵ کەمتر تاوانە. لە ساڵی 1991 دا ئەوپەڕی سەرانەی کەسێك کە جگەرە بە لە 16 ساڵ کەمترەکان بفرۆشێت لە 400 پاوەندەوە کرا بە 2500 پاوەند. لە ساڵی 2003 ێشەوە ڕیکلامکردن بۆ جگەرەو هاندانی خەڵك بۆی لە UK قەدەغەکرا.

7. قات Khat: قات دەوەنێکی گەڵا سەوزە، ناوە زانستییەکەی Catha edulis و گەڵاکانی بەدرێژایی چەندەها سەدە لەلایەن ئەو نەتەوانەوە دەجوێت کە لە پشتێنەی ئەفریکی و نیمچەدورگەی عەرەبیدا دەژین. لەمدواییانەدا گەیشتە ئەورووپاو هەروەها UK بەتایبەتی لەنێو کۆچکەران و پەناهێندەکانی وڵاتانی وەك سۆماڵ، ئیسیوپیاو یەمەن. قات بەگەلێك ناو ناسراوە وەك: جات، کات، خات، چات، چای ئەبوسیناو زەلاتەی ئەفریکی.

قات دوو پێکهاتەی چالاکی هەیە cathinone و cathine " cathinone مادەیەکی کیمیاوییەو لە جۆری Schedule 1 بەپێی پێوەری کۆنترۆڵکردنی دەرمانە نایاساییەکانی ئەمریکا وکاریگەرییەکی وەك کاریگەری ئەمفیتامین دروستدەکات لەسەر کۆئەندامی ناوەندی دەمارو

وورپـــای دەکاتـــەوە. کاریگـــەری ئـــەم مادەیـــە دوای 48 کاتـــژمێر لـــە لێکردنەوەی گەڵاکان دەستدەکات بە کەمبوونـەوە، بـەڵام ئەگـەر لـە بـەفرگر یان بەستەردا

هـەڵبگیرێت بـۆ ماوەیـەکی زۆرتـر دەمێنێتـەوە. Cathine لـە جـۆری Schedule IV بـەپێی پێـوەری ئـەمریکی‌و کاریگەرییـەکی زۆر کـەمتری هەیە لە cathinone بەڵام دوای بڕین‌و لێکردنەوە کاریگەرییەکەی لەدەست نادات.[1]

قات لە کێڵگەکانیدا دەبڕرێت‌و چەپك چەپك دەبەسترێت‌و بێجگە لەوەی کە لەناوخۆی ئەو وڵاتانەدا برێکی ئێجگار زۆری لێبەکاردێت بەئاشـکراو بـەڕێگای هـەوایی ڕەوانـەی زۆر وڵات دەکرێـت کـە یـەکێکیان بەریتانیایـە. لـە ناوچـەی حۆرمـەڵاتی لەنـدەن لـە دوکـانی سـەوزەو میوەکانـدا بـە تـەڕوتازەیی دەفرۆشـرێت چەپکی





Two men chewing khat

[27] Drug Intelligence Brief –Khat, June 2002- US Drug Enforcement Administration [online]

بە 4 پاوەند! [28] قات ئەگەر بە تەڕی بجورێت کاریگەری زیاترە ئەگەرچی دەشکرێت بە چاو جۆرە بنێشتێکو تەنانەت ووشکدەکرێتەوەو دەکێشرێت.

لە کەشکۆڵە عەرەبییەکانی سەدەی سیازدەدا باسی قات هاتووە. حەکیمەکان قاتیان بۆ چارەسەری خەمۆکیو بێتاقەتیو بێهێزی بەکارهێناوە. لەبەرئەوەی کاریگەرییەکی وورپاکەرەوەی هەیە، وەرزێرەکان بەکاریان هێناوە بۆ ئەوەی ووزەیان بداتێ بۆ کارکردنی سەختو دووروودرێژ.

لە زۆر لەولاتە موسوڵمانەکاندا، چونکە ئەلکهول بەتەواوی قەدەغەیە، بەشێوەیەکی گشتی قات لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکاندا بەکاردێت، ئەگەرچی لەسەر بناغەی ئاینیو کولتوری زۆر جار قات سەرکۆنە دەکرێتو لە ئاینی ئیسلامدا زانیاری ڕێگەپێدان یان حەرامکردنی بەدەستەوە نییە.

ئێستاکە لەسەرتاسەری جیهاندا چەندەها ملیۆن کەس قات بەکار دەهێنن. بەرهەمهێنانی قات کۆڵەکەیەکی گرنگی ئابوری ولاتە بەرهەمهێنەکانە وەک سۆماڵو یەمەن. هەروەها لە ولاتانی دیکەی وەک کینیاو ئەسیوپیاشدا بۆ هەناردن بەرهەم دەهێنرێت.

لە گەلێک ولاتی ئیسلامیدا قات وەک جێگرەوەی ئەلکهولو هەروەها وەک یارمەتیدەرێکیش بۆ توانای بەرەنگاری برسێتیوماندویەتی مانگی ڕەمەزان بەکارهاتووە.

ڕاپۆرتەکان وادەگەیەنن کە لە یەمەن لە هەر چوار پیاو یەکێکیان قات بەکاردەهێنێتو لە ڕێژەی 40٪ی بودجەی خێزانەکە زیاتر دەبات. [29]

---

[28] Drug Scope [online]

[29] Drug Intelligence Brief –Khat, June 2002- US Drug Enforcement Administration [online]

بازاڕی کڕین‌و فرۆشتنی قات لە سەنعای پایتەختی یەمەن:[30]

چونکە قات دەرمانێکی ووریاکەرەوەیە جوونی دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو



کەسە ووریاو زیتەڵەو زیاتر چەنەباز بێت‌و ئارەزوی خواردنیشی کەمدەکاتەوە. بەکارهێنەرانی دەڵێن کاریگەرییەکی هێمنکەرەوەی هەیە ئەگەر لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا بەکار بێت. بەکارهێنانی بەردەوامی دەبێتە هۆی بێخەوی Insomniaو دڵەڕاوکێ‌و Anorexia (تێکچونی ئارەزووی خواردن) . لە هەندێك باردا خەڵکی زیاتر هەستدارو توڕە دەکات‌و پێدەچێت ببێتە هۆی کاری توندوتیژی. بەکارهێنانی بەبەردەوامی دەبێتە

[30] All about Khat [online]



هۆی خوگری سایکۆلۆژییو بەرجۆرە بەکارهێنەران بێتاقەتو بێزاردەبن ئەگەربەردەوام نەبن لەسەریلە بەریتانیا بەکارهێنەرانی بەردەوامی لەنێو پەنابەرە سۆمالییەکاندا بووەتە جێگای سەرنجو پێویستە ئەو مەسەلەیە بەهەند وەربگیرێت.[31]

لەلایەنی یاساییەوە قات لە ئەمریکا بەتەواوی قەدەغەیەو یاساغە. پەنابەرە یەمەنییەکانی نیشتەجێی بەریتانیا لە کۆنفرانسی 2003ی لەندەندا ( کە خۆم ئامادە بووم) بانگەوازی ئەوەیاندەکرد کە لە UK هەروەك ئەمریکا قات قەدەغە بکرێت. بەڵام تا ئێستا لە بەریتانیا ئەو دەرمانە قەدەغە نەکراوە ئەگەرچی ئێستا لەژێر باسو لێکۆڵینەوەدایەو وا چاوەڕوان دەکرێت کە لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا هەڵوێستی لێوەربگیرێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕووەکی قات خۆی لە UK قەدەغە نییە بەڵام ڕەگەزە چالاکەکانی cathinone و cathine بە دەرمانی پۆلی C پۆلێنکراون. شایانی باسە بێجگە لە ئەمریکا لە کەنەدا، نەرویجو سویدیش ئەم دەرمانە قەدەغەیە.

---

[31] **Drug Scope [online]**

# هێمنکەرەوە یان کپکەرەوەکان Depressants

1. ئەلکهول Alcohol: وشەی ئەلکهول لە وشەی عەرەبی (الكحول) ەوە هاتووە. هەندێك سەرچاوە دەڵێن گوایە بناغەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وشەی الغول کە مانای دێو یان بونەوەرێکی پەنهان دەگەیەنێت‌و بەرانبەر وشەی Spirit ی ئینگلیزی کە نزیکەی هەمان مانا دەگەیەنێت‌و بۆ خواردنەوە ئەلکهولییە بەهێزەکان بەکاردێت لە زۆر لە زمانە خۆرئاواییەکاندا.[32] وشەی الغول لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی 37 ئایەتی 47 دا (الصافات) دا باسکراوە[33] لەوەسفی ئەو خواردنەوەیەدا کە لە بەهەشتدا پێشکەش دەکرێت‌و الغولی تێدانییە، بەڵام بەتەواوی ڕوون نییە کە ئەو الغولە ئەلکهولە یان نا هەرچەندە وشەی Spirit کە خۆرئاواییەکان بۆ خواردنەوە ئەلکهولییە بەهێزەکان بەکاریدەهێنن هەمان مانا دەبەخشێت‌و ئەگەری مەسەلەکە وەك وەرگێڕانێکی ئەو وشەیە زیاتردەکات. هەندێکی دیکە دەڵێن پێدەچێت لە (الکهل)ەوە هاتبێت کە کل دەگرێتەوە.[34] بەهەر جۆر بێت بەتەواوی بناغەی وشەکە ڕوون نییەو نازانرێت لەکوێوە هاتووە بەڵام پێدەچێت وشەی ئەلکحول لە سەردەمی عەباسییەکاندا شانبەشانی وشەکانی دیکەی وەك ئەلکیمی‌و ئەلجێبرا بەعەرەبی بڵاو بوبێتەوە کە لە بنەڕەتدا بەرهەمی ئەرکو ماندوبوون‌و شەونخونی هەموو زانا خۆرهەڵاتییەکانی ئەو سەردەمە بوون نەك تەنها عەرەبەکان" بەڵام زمانی نوسین عەرەبی بووە.

[32] Wikipedia encyclopaedia (2005) [online]
[33] Holy Quran [Online]
[34] Wikipedia encyclopaedia (2005) [online]

وەك پێشتر باسکرا مادەی ئەلکهول زۆر لە وشەی ئەلکهول (وەك ناو) کۆنترەو لە شارستانییە کۆنەکاندا ناسراوە ئیتر بەهەر ناوێکەوە بوبێت، گرنگ ئەوەیە مادەی ئیسانۆل Ethanol دەگرێتەوە کە لەگەڵ میسانۆل Methanol دوو جۆرە سەرەکییەکەی ئەلکهول پێکدەهێنن. دیارە گەلێك جۆری دیکەی ئەلکهول هەیە بەڵام پەیوەندییان بەبابەتی ئەم کتێبەوە نییە. لە خوارەوە پێکهاتە کیمیاوییەکانی ئەو دووانە ڕوونکراوەتەوە:



Methanol[7]




ئەلکهول بێجگە لەمەبەستی خواردنەوەو مەستی لە پیشەسازیدا بۆ گەلێك مەبەست بەکاردێت. لەگەڵ ئەوەی کە گەلێك جۆر ئەلکهول هەیە ئیسیل ئەلکهول تاکە جۆرێکە کە دەخورێتەوە هەربۆیە بۆ مەبەستی ئەم کتێبە ئەلکهول واتە ئیسیل ئەلکهول. ئیسیل ئەلکهول یان



ئیسانۆل شلەمەنییەکی ڕوونی بێڕەنگەو لە پێکهاتە کیمیاوییەکانی کاربۆن، هایدرۆجین‌و ئۆکسجین پێکهاتووەو هاوکێشە کیمیاوییەکەی بەمجۆرەیە: $C_2H_5OH$.

ئەلکهول دەکرێت بەشێوەیەکی دەستکرد لە لایەن کیمیاوییەکانەوە لە تاقیگەدا دروستبکرێت، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لە ئەنجامی گەنینی میوەو سەوزەو دەغڵودانەوە بەرهەمدێت. بەمجۆرە مەی لە ترێ‌و بیرە لە جۆو چەندەها جۆری دیکە لە سێو‌و میوەهاتی تر بەرهەمدێن.

ئەلکهول لەسەرتاسەری جیهاندا لەژێر هەزاران ناوی بازرگانیدا دەفرۆشرێت بەڵام هەموویان هەر لەسەر بناغەی یەك مادە دروستدەکرێن کە ئەلکهولەو ئەوەی کە جیاوازە ڕێژەی ئەلکهولە بۆ تێکڕای



شلەمەنییەكە. خواردنەوە ئەلكهولییەكان بەو پێوەرە بەهێزی‌و لاوازییان دەستنیشان دەكرێت‌و دیارە تا ئەلكهولی زیاتر بێت مەترسی زیاترە. بۆنمونە بوتڵێك ویسكی یان براندی یان جن 40٪ی ئەلكهولەو بوتڵێك مەی (شەراب) 20٪ی ئەلكهولەو بوتڵێك شەرابی سەرمێزی مامناوەندی 11٪ ی ئەلكهولەو بوتڵێك بیرە 4٪ ئەلكهولە. [35] بەرزترین ڕادەی ئەلكهول لەلایەن كۆمپانیایەكی ئێستوانییەوە تۆماركراوە كە لە سەردەمی سەربەخۆیی ئیستوانیادا لەنێوان دوو جەنگە جیهانییەكەدا توانیویانە 98٪ ئەلكهول لە پەتاتە دەربهێنن! [36] بێگومان پێكهاتەی خواردنەوەكان لە كۆمپانیایەكەوە بۆ كۆمپانیایەكی دیكە دەگۆڕێن‌و بیرەی وا هەیە لە بازاڕدا كە ڕێژەیەكی زۆر زیاتر ئەلكهولی تێدایە. ئەوەی كە لە عێراقدا دروستدەكرێت‌و بە عەرەقی عێراقی ناسراوە لە ڕیزی پێشەوەی خواردنەوە ئەلكهولییەكاندایەو ڕێژەیەكی بەرز ئەلكهولی تێدایە كە 45٪ ە بەلام عەرەقی سووریی لەوەش بەهێزترەو ڕێژەی ئەلكهولەكەی دەكاتە 53٪! ئەو باق‌و بریقەی كە كۆمپانیاكان دەیدەن بە ناوو ماركە بازرگانییەكان هیچ لە مەسەلەی مەترسییەكان كەم ناكاتەوە بەلام ئاشكرایە ئەو خواردنەوانەی كە پێیان دەڵێن (فەل) مەترسییان زیاترە لەبەر نەبوونی هیچ جۆرە كۆنترۆڵێكی جۆر لەسەریان‌و دڵنیانەبوون لە پوختەییان‌و ڕادەی ئەو ئەلكهولەی كە تێیاندایە.

خواردنەوەی ئەلكهول، هەروەك پێشتر باسكرا بەشێكە لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵكانێكی زۆر لە جیهانداو بەتایبەتیش لە وڵاتە پیشەسازییەكاندا. بۆ نمونە

---

[35] Armitage, R., (1987) Let's Discuss DRINKING. Hove: Wayland Publishers Ltd. P.8

[36] The Guinness Book of Records 1997 p. 92

بەپێی ئاماری ساڵی 1998 ٪95 دانیشتوانی شانشینی یەکگرتوو ئەلکهول دەخۆنەوە.[37]

ئەلکهول لەگەڵ ئەوەی کە قەدەغە نییە بە شێوەیەکی فراوانیش ڕیکلامی بۆ دەکرێت (بەلام بەکارهێنانی منالان بۆ ئەو مەبەستە قەدەغەیە) بە پێچەوانەی جگەرەوە کە ئێستا ڕیکلام بۆ کردنی لە تەلەفیزۆنو هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی گشتیدا لەزۆر شوێن قەدەغەیەو یاساغە. لە ولاتە تازەپێگەیشتوەکانیشدا لەنێو چینی ناوەندو ئەنتلیجسیادا زۆر برەوی هەیەو زیاتر وەك دیاردەیەکی خۆرئاواییانەو پێشکەوتوو کەشخەو دەوڵەمەندانە چاوی لێدەکرێت. هۆکارەکانی خواردنەوەی ئەلکهول زۆرنو جۆراوجۆرنو زۆریان لە شوێنی جیاجیای ئەم کتێبەدا ئامارەیان بۆکراوە. بەلام ئەوەی جێگای سەرنجە خەڵکی تەنها کاریگەرییە هەنوکەییەکانی ئەلکهول دەبینن‌و کەمتر ئاگاداری کاریگەرییە درێژخایەنەکانی ئەو دەرمانەن. ئەوەی سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە لە خۆرئاواش دەمێکە نییە مەترسییەکانی ئەلکهول بەو شێوەیەی ئێستای بووەتە جێگای سەرنجی شارەزایان.

لە 15ی مارتی 2005دا کەناڵی تەلەفیزیۆنی BBC ی بەریتانی ڕایگەیاند کە ژمارەی ئەو نەخۆشانەی کە دێنە نەخۆشخانە بەهۆی نەخۆشی جگەری ئەلکهولییەوە لە ماوەی 13 ساڵی ڕابوردودا لە دووقات بەرەوژوور زیادیکردووە. " لەنێوان 1989و 2003دا ژمارەی نەخۆشە پیاوەکان ٪116و

[37] Home Office UK, (2004) Substance Misuse and the Workplace. A training pack. P. 2.29

نەخۆشــە ژنــەکانیش 108٪زیــادیکردووە."[38] ئــەم ئامارانــە لەلایــەن نەخۆشخانەی سێت جۆرجی لەندەن و نوسینگەی نیشتمانی ئامارەکانەوە پێشکەشکراون.

ئەلیسن ڕۆجەرس کە لێپرسراوی گشتی پەیماننامەی جگەری بەریتانییە دەڵێت:

**"کێشەکە لەوەدایە ئێستاکە دەبینین ژمارەیەکی هەرچی زیــاتری گەنجانــە دەکەونــە بــەر کاریگــەری خواردنــەوەی ئەلکهول. تێکچونی جگەری ئەلکهولی یان وێرانبوونی جگەر بەهۆی ئەلکهولەوە ماوەی 10 تا 20 ساڵی پێدەچێت. لەبەر ئەوەیــە کــە لــە ڕابــوردودا بــە کاریگەرییــەکانی ئــەو نەخۆشییەمان نەدەزانی تا ئەو کەسانە دەگەیشتنە تەمەنی پــەنجا ساڵی یــان شەســت ساڵی. بــەڵام ئێــستا ئــەوەتا لــە کەسانێکدا دەیبینین کە تەمەنیان چل ساڵەو پێویستیان بە چاندنی جگەر هەیە."[39]**

جگــەری کەســە نەخۆشــەکە بــە ســێ قۆناغــدا تێدەپــەڕێت لــە جگــەرێکی چەورەوە بۆ زەردووی ئەلکهولی و دواییش بۆ تێکشکاندنی تــەواوەتی" وەك لەو وێنانەدا نیشاندراوە:

---

[38] BBC News [online]
[39] Ibid

ئەلکهول لەلایەن سوڕی خوێنەوە هەڵدەمژرێت و لەماوەی 5-10 خولەکدا کاریگەرییەکەی دەردەکەوێت. ئەو کاریگەرییە دەکرێت چەندەها کاتژمێر بمێنێتەوە، بەپێی ئەو ڕێژەیەی کە چووەتە نێو سوڕی خوێنەوە. کاریگەرییەکانی پشتدەبەستن بە:



Fatty Liver



Alcoholic Hepatitis



Cirrhosis




❖ ئەو کەسە چەند بەخێرایی خواردویەتییەوە، ناوسکی خاڵی بووە یان تێر بووە، و هەروەها کێشی کەسەکەش.

❖ ئەو کەسە تا چ ڕادەیەک لەشی لەگەڵ خواردنەوە ڕاهاتووە، یان بەشێوەیەکی تر ڕادەی قبوڵکردنی لەشی چۆنە بۆ ئەلکهول.

❖ ئەو کەسە باری دەرونی چۆن بووە پێش خواردنەوە. ئەو کەسانەی کە بە ئارامی‌و دڵی خۆشەوە دەخۆنەوە کەمتر ئەگەری توندوتیژی‌و توڕەیی‌و هەڵەشەییان هەیە. هەندێك کەس خەم‌و مەینەتییەکانیان بە خواردنەوە دەردەبڕن، بەلام بۆیاندەردەکەوێت کە زۆر لە پێشتر خراپتریان بەسەردێنێت.

دوای خواردنەوەی چەند پێکێکی کەم بەکارهێنەران هەست بە حەوانەوەو دڵخۆشی‌و متمانەبەخۆبوون دەکەن. ئەلکهول دەرمانێکی ئارامبەخشە. کاردەکاتە سەر کۆئەندامی ناوەندی دەمار بۆ ئەوەی لەش هێواش‌و هێمن بکاتەوە. زۆرکەسیش بەپێچەوانەوە توندوتیژو شەڕانی دەبن، بەتایبەتی پیاوان. زۆربەی ئەو توندوتیژیانەی کە لەسەر شەقامەکان‌و نێو ماڵەکاندا ڕوودەدەن، کە ژنان‌و منداڵان دەبنە قوربانیی، کاتێك ڕوودەدەن کە خەڵك سەرخۆشن.[40] دوای خواردنەوەی بڕێکی زیاتر، کەسەکان زیاتر دەشێوێن‌و قسەکانیان خاوخلیچك دەبێتەوە. پێدەچێت ببێتە هۆی بینینی دووفاق Double Visionو لەدەستدانی هاوسەنگی‌و ڕشانەوەو هەندێك جاریش بورانەوە.[41]

خواردنەوەی ئەلکهول ئەگەری کارەسات زیاتر دەکات، بەتایبەتی وەك کارەساتی ڕێگاوبان‌و کەوتنەخوارەوەو بەکارهێنانی ئامێری هەستیارو وردەکاری بەشێوەیەکی هەڵەو ترسناك. زۆر جار بەکارهێنانی چەکو تەقەمەنی لەنێوان گروپێکی هاوڕێدا وەك شێوەیەك لە شێوەکانی یاری‌و

[40] Drug Scope [Online]
[41] Home Office UK, (2004) Substance Misuse and the Workplace. A training pack. P2.22

خۆشی دەربڕین کارەساتی جەرگ بڕی لێکەوتوەتەوە. بەهۆی کەمبوونەوەی شەرم‌و گوێنەدان بە پێوەرەکان ڕەنگە بەکارهێنەران بخاتە هەڵوێستی ئەوتۆوە کە دوایی زۆر پەشیمان بن لێی. زۆر تر ئەگەری کاری سێکسی ناسەلامەت‌و نایاساییان هەیە. خواردنەوەیەکی زۆر بەیەك ژەم ڕەنگە نەك هەر ببێتە هۆی لەهۆشخۆچون بەڵکو مردنیش بەهۆی خنکانی ئەوکەسەوە بە ڕشانەوەکەی خۆی.

ئەلکهول زۆر ترسناکە ئەگەر لەگەڵ دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکانی دیکەدا بەکاربێت. بەتایبەت مەترسییەکەی زۆر زیاترە ئەگەر لەگەڵ دەرمانە هێمنکەرەوەکانی دیکەدا بەکاربێت یان لەگەڵ ئەو دەرمانانەی کە بۆ چارەسەری خەمۆکی بەکاردێن‌و دەرمانە ئازارشکێنەکانیش. بەکارهێنانی ئەلکهول لەگەڵ ئەو دەرمانانەدا بووەتە هۆی مردنی گەلێك کەس لە ئەنجامی زۆریی ڕێژەی مادە هۆشبەرەکانەوە.

ئەوانەی کە بڕێکی زۆر دەخۆنەوەو بەردەوامن لەسەری بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، دەبێتە هۆی گەلێك کێشەی وێرانکەری دەرونی‌و جەستەیی وەك: خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، لەدەستدانی بیرو هۆش، پیربوونی ناوەخت، بەردەوام کۆکین‌و سەرمابوون، هەوکردن، پنیمۆنیاو سیل، شێرپەنجە، دڵەکوتێ، تێکچونی جگەر، سکچون‌و زامداربوونی گەدە، هەوکردنی پەنکریاس، کەمخۆراکی‌و نەخۆشییەکانی گورچیلە.[42] بەپێچەوانەی ئەوەوە کە باوە ئەلکهول نابێتە هۆی جێگرتنەوەی شلەمەنی‌و یارمەتی گورچیلەکان نادات بۆ

[42] Barber, J., G., (2002) Social Works With Addictions. 2nd ed. London: Palgrave.P. 5-6

پاککردنـەوەیان، بـەڵکو بەپێـچەوانەوە ئـەلکهول لـەش ووشـکهەڵدەهێنێتو شلەمەنی نێو لەش دەمژێتو هـەر بـەو هۆیەشـەوەیە کـە ئەوانـەی ئـەلکهول دەخۆنـەوە بـۆ ڕۆژی دواتـر هەسـت بەسەریەشـە دەکـەن لەئـەنجامی کـەمی شلەمەنییەوە لەلەشیاندا.

ڕاستە ئەلکهول دەبێتە هۆی میزکردنی زیاتر لـەماوەی 20 خولەکدا بـەلام ئـەو میزکردنـە ئاسـاییینییەو ڕوونـە چـونکە ئـەلکهول دەبێتـە هـۆی تێکـدانی سیستەمی هۆرمۆنی نێو گورچیلەکانو بەرگرتن لە پژاندنی مادەیەك کـە پێـی دەڵێن هۆرمۆنی ADH کە بەرپرسیارە لـە خەسـتکردنەوەی میـزو ڕاگـرتنی تەرازوی ئەو مادانەی کە دەچنە نێو خوێنەوە یان لەگـەڵ میـزدا تورِدەدرێنـە دەرەوە.[43]

بێگومـان بـڕی ئـەو ئەلکهولـەی کـە دەخورێتـەوەو ڕادەی بـەردەوامبوون لەسەریو تەمەنی ئەو کەسە ڕۆڵی بەرچاویان هەیە لەم پرۆسەیەدا.[44] لێرەدا بەپێچەوانەی بیروڕای باوەوە ئەلکهول نەك هەر یارمـەتی گورچیلە نـادات بـۆ پاکبوونـەوە بـەڵکو ئەگـەری بـەردی گورچـیلەش زیـاتر دەکـات بـەهۆی ووشکهەڵاتنو ڕوونکردنەوەی میـزو مانـەوەی بڕێکـی زیـاتری مادەکـان لـەنێو گورچیلەدا.[45]

لەلایـەکی دیکەشـەوە چـونکە ئـەلکهول دەبێتـە هـۆی یارمەتیـدانی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن لە هەمانکاتیشدا دەبێتە هۆی قورسایی خستنە سەر گورچیلەکانو کاریگەرییەکانیشی لەسەر

---

[43] Epstein, M., M.D. (1997) Alcohol Impact on Kidney Function. NIAA [online]
[44] Ibid.
[45] June Russell's Health Facts. Alcohol- Kidney and Bladder. [online]

جگەر بەهەمانشێوە هاوتاهەنگە لەسەر فشارخستنە سەر گورچیلەكانیش.

لەم وێنەیەدا دڵێكی ئاسایی ( دەستە چەپ) كە قەبارەی بچوكەو دڵێك كە بەهۆی ئەلكهولەوە تووشی نەخۆشی بووە بەرانبەر كراون:



لەم وێنەیەدا ئەو ناوچانەی مێشك دەستنیشانکراون کە زیاتر دەکەونە بەر مەترسی کێشە ئەلکهولییەکان:







ئەم وێنەیە مێشکی کەسێك کە کۆنترۆڵی هەیە بەسەر خۆیدا (دوو وێنەی بەشی سەرەوە) لەگەڵ کەسێکی دیکە کە ئەلکهولییە (بەشی خوارەوە) بەراەبەر کراوە:

هەروەها ئەلکهول نەك هەر مرۆڤ تووشی خوگری سایکۆلۆژی دەکات بەڵکو ئالودەکەریشە" واتە

مرۆڤ ناچارە بەردەوام بڕی زیاتر بخواتەوە بۆ ئەوەی بگاتــەوە ئــەو نەشئەو خۆشییەی جاری پێشوو. بەمشێوەیە ئەگەر بەردەوام بـڕی خواردنەوەکــەی زیــاد بکــات ئــەوا دەکەوێتــە نێــو زۆنگــاوی ئالودەبیەوەو دەبێت بەدوای سەراویلکە (سەراب) دا ڕابکات.

خۆ ئەگەر دەستیشی نەکـەوێت یـان بیـەوێت دەسـتبەرداری ببێـت ئــەوا ئاســەوارەکانی پاشەکــشەی لێدەردەکــەوێت وەك: لــەرزین، ئارەقکردنەوە، دڵـەڕاوکێ، وڕێنـەو بزڕکانـدن. لـەم قۆناغەدایـە کـە بەکەسـێك دەوترێـت ئـەلکهولی Alcoholic نـەك هەرکەسـێك دەمی بۆبرد.

لە کوردستان وشەی عەرەقخۆر وەك توانجو تانـەو دەتـوانین بڵـێین جنێـویش بـەکاردێت بـەڵام لەڕاسـتیدا ئـەو نێـوە تـەنها ئەوانـە دەگرێتەوە کە ئالودەی ئەلکهول بوونو ناتوانن دەسـتبەرداری بـبن (دیارە ڕێگای دەرچوون بەتـەواوی دانـەخراوەو لـە شـوێنی دیکـەدا باسیدەکرێت).

ئەلکهول کاریگەری هەیە لەسەر سیستەمی زاوزێـی مێیینـەو ئـەم کاریگەرییە هەر لە قۆناغی هەرزەکارییەوە مەترسی هەیە تا کۆتایی تەمــەنی زاووزێ. کاریگەرییــەکان لــە خانــەکانی مێــشکەوە دەستپێدەکەنو لە کۆتایی سیستەمی زاووزێدا کۆتاییان پێدێت:


Hypothalamus
LHRH
Pituitary
LH
FSH
Ovaries
Progesterone
Estrogen

کاریگەری ئەلکهول بۆ ژنانی سکپڕ گەلێك مەترسیدارە چونکە سەرباری هەموو کاریگەرییە گشتییەکانی دیکە، چ بۆ ژن‌و پیاو پێکەوەو چ تایبەت بە ژنان، کاردەکاتە سەر ئەو کۆرپەیەش کە بەرهەمیدەهێنێت.

کۆرپەکە زۆر نزیکە گەلێك شێوانی جەستەیی‌و نائاسایی بوونی ڕەفتاری‌و ئاسەوارەکانی پاشەکشەی پێوە دیاردەبێت کە هەموویان پێکەوە پێیان دەڵێن نیشانەکانی کۆرپەی ئەلکهولی. لەو دوو وێنەیەی خوارەوەدا گەلێك نیشانەی ڕوخساری‌و شێواندنی زگماکی کۆرپەلەی دایکە ئەلکهولییەکان ڕوونکراوەتەوە ( ئەمە تەنها بۆ زانیاری گشتییە بۆیە وردەکارییەکانی وەرنەگێڕاوە):

گەلێك هەڵمەتی دەوڵەتان‌و نێو دەوڵەتی لەئارادایە بۆ بەرگرتن لەو زەرەرو زیانە ماددی‌و ئەدگاری‌و تەندروستیانەی كە بەهۆی ئەلكهولەوە ڕوودەدەن، خراپترین شێوەیان

ئەوەیە كە كۆرپەلەیەكی چەند سانتیمەتری نێو منداڵدانی دایكێكی ئالودەبوو دەبێتە قوربانیی" لێرەدا دوو پۆستەر دەخەمە ڕوو كە لەلایەن دەزگای ووشیاربوونەوە لە نیشانەكانی ئەلكهولیبوونی كۆرپەلەی شانشینی یەككگرتوەوە بڵاوكراونەتەوە:

❖ ئەگەر لەكاتی سكپڕیدا بخۆیتەوە منداڵەكەشت دەخواتەوە!






❖ تەنانەت یەك پێكیش بۆی هەیە ڕاستەوخۆ بگاتە نێو سەری منداڵەكەت! لەبواری نێودەوڵەتیشدا دوای چەندەها پێشنیار بۆ لێكۆڵینەوەیەكی نێودەوڵەتی دەربارەی زیانەكانی ئەلكهول لەلایەن دەوڵەتانی كۆمەڵەی ئەورووپی‌و دەوڵەتانی دیكەشەوە ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی WHO ڕازیبوو بە دەستبەكاربوون بۆ ئەو پرۆژەیە، دوای بڵاوكردنەوەی ڕاپۆرتێك كە تێیدا هاتبوو كە ئەلكهول 1.8 ملیۆن كەسی لەسەرتاسەری جیهاندا كوشتووە لە ساڵی 2000دا. هیوادارن ئەو ڕاپۆرتە ببێت بە هەنگاوێكی نێودەوڵەتی دژی ئەلكهول هەروەك چۆن لەدژی جگەرە بەرپاكراوە. هەروەها ڕاپۆرتەكە داخوازی گوفتوگۆشی كردووە لەگەڵ بەرهەمهێنەرانی ئەلكهولدا.[47]

خواردنەوەی ئەلكهول بە ڕادەی زۆر دەبێتە هۆی گەلێك كێشەی تایبەتی، خێزانی، كاركردن‌و كێشە ماددییەكان‌و ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لە داڕوخاندنی خێزان‌و دەستلێكبەردان‌و توندوتیژی وشێوەكانی دیكەی تاوان كە پەیوەندییان بە لەدەستدانی كۆنترۆڵەوە هەیە. ئەم كێشانە ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو لەزیادین‌و وەك نمونە چەند ئامارێكی شانشینی یەكگرتوو لێرەدا نیشاندەدەم:

❖ ئەو كێشانەی كە پەیوەندییان بە ئەلكهولەوە هەیە ساڵانە 3 بلیۆن پاوەند خەرجی زیاتر دەخەنە ئەستۆی خزمەتە تەندروستییە نیشتمانییەكان.

---

[46] Foetal Alcohol Syndrome aware UK [online]
[47] Ibid

❖ لە هەر چوار پیاو کە دێنە نەخۆشخانە یەکێکیان بەهۆی ئەلکهولەوەیە.

❖ نزیکەی 33.000 کەس ساڵانە بەهۆی ئەلکهولەوە دەمرن.

❖ ئەو تاوانانەی کە بەهۆی ئەلکهولەوە ڕوودەدەن ساڵانە 50 ملیۆن پاوەند مەسرەف دێننە سەر حکومەت.

❖ نیوەی ئەو کەسە باڵغانەی کە بەهۆی برینداری سەرەوە دێنە نەخۆشخانە سەرخۆشن.

❖ کارەساتەکانی ڕێگاوبان ساڵانە 950.000 پاوەندیان تێدەچێت بە مەسرەفی پۆلیس و تەندروستی و هتد...

❖ 46٪ ی دامەزراوە بەریتانییەکان کێشەی خراپ بەکارهێنانی ئەلکهولیان ڕاگەیاندووە لەلایەن کارمەندەکانیانەوە چ وەك بەرز بوون لەشوێنی کار یان هەڵەو نزمبوونەوەی ئاستی بەرهەمهێنانیانەوە.[48] یەکێك لەو کێشانەی کە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ئاماژەی پێکردووە مەسەلەی هەبوون و ئاوەڵابوون و هەرزانی ئەلکهولە لە زۆر وڵاتی جیهاندا.

بۆ نمونە لە زۆر وڵات نرخی بوتڵێك بیرەو بوتڵێك خواردنەوەی گازی بەهەمان قەبارە وەك یەکە، هەندێك جار تەنانەت لەگەڵ بوتڵێك ئاوی کانزایشدا! بەڵام لەهەندێك وڵاتی دیکە کە ئەلکهول قەدەغەیە وەك کۆماری ئیسلامی ئێران نرخی بوتڵێك بیرە 22 جار لە نرخی بوتڵێك خواردنەوەی

[48] Home Office UK, (2004) Substance Misuse and the Workplace. A training pack. P.2.29-2.30

گازی گرانترە.[49] بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەر خەڵك دەیکڕن‌و زۆر جاریش ئەوە دەبێتە هۆی دروستکردنی جۆری خراپ (فەل) لە ماڵاندا یان پەنابردن بۆ جۆرەکانی دیکەی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان کە ئەوە کێشەکە ئەوەندەی دیکە ئاڵۆز دەکات.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە ئەمریکا هەست بەوەکرا کە ئەلکهول خەریکە دەبێتە کێشەیەکی گەورەو لە گەلێك لە هەرێمە باشورییەکاندا بەتەواوی قەدەغە کرابوو. لە ساڵی 1919دا ئەلکهول بەتەواوی یاساخ کرا لەسەرتاسەری ئەمریکادا. هێندەی نەبرد خەڵك فێربوون چۆن بەشێوەی نایاسایی دروستی بکەن‌و بیفرۆشن. باندەکانی مافیا کەڵکیان لەوە وەرگرت‌و دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکانی دیکەش پەرەیان سەند. ڕێژەی تاوان زیاتر چووە سەرو توندوتیژی برەوی سەند. لە ئەنجامدا لە ساڵی 1933 دا ئەو یاسایەی کە ئەلکهولی یاساخ کردبوو هەڵوەشێنرایەوە.

لە کۆنفرانسی لەندەنی 2003 دا زۆر دەنگ بەرز بوەوە کە دەیانووت: ئێوە دوو جۆر دەرمانی سەرەکیتان ئازادکرووە کە جگەرەو ئەلکهولن بەڵام باس لە بەرگرتن لە دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان دەکەن.

بەڵام کاربەدەستان لەوەڵامدا ووتیان ئەو ئەزمونەی ئەمریکا سەلماندی کە یاساخ کردنی یاسایی چارەسەری کێشەکە ناکات‌و بەڵکو ئاڵۆزتریشی دەکات ئەگەر پشتگیرییەکی جەماوەری هۆشیارکردنەوەو پەروەردەیی لە پشتەوە نەبێت.

[49] WHO-(2004) Global Status Report: Alcohol Policy. Geneva. [online]

لێرەدا نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە ئەمڕۆ ئەلکهول سەرچاوەیەکی سەرەکی داهاتە بۆ زۆر لەدەوڵەتان و لەلایەنی کۆمەڵایەتی و کولتورییشەوە بەشێکە لە ڕێوڕەسمی ژیانی ڕۆژانەی زۆر کۆمەڵگاو هەروا بەئاسانی ناتوانن دەستبەرداری ببن. ئەوەی ئەمڕۆ هەوڵی بۆ دەدەن ووشیارکردنەوەو بە ئاگاهێنانەوەی ژمارەیەکی هەرچی زیاتری خەڵکە بەتایبەتی گەنجان لە مەترسییە جۆراوجۆرەکانی ئەلکهول و دانانی بەردی بناغەی کۆمەڵگایەکی مۆدێرنی تۆکمەو پتەو. هاندانی یانەو شوێنی بیداری نائەلکهولی و پشتگیریکردنی نائەلکهولییەکان کە پێدەچێت لە داهاتودا ژمارەیان بەرەو زیاتر بڕوات.

کێشەیەکی تر ئەو خواردنەوانەیە کە پێیان دەڵێن ئەلکۆپۆپ Alcopop و لەشێوەی ئاوی لیمۆو شەربەتی میوەدان و گەرچی تامی ئەلکهول نادەن بەڵکو ئەلکهولیان تێدایەو، هەندێکیان بەڕادەیەکی بەرزیش. هەندێک کەس دەڵێن ئەو کۆمپانیانە بۆیە ئەو جۆرە خواردنەوانە بەرهەمدەهێنن تا منداڵان و گەنجان زیاتر بە ئەلکهول ڕابهێنن و ئالودەیان بکەن. منداڵان بەگشتی حەزیان لە تامی ئەلکهول نییە بۆیە ئەوان لەشێوەی ئاوی میوەدا دروستی دەکەن[50].

### ئایا ئەلکهول هیچ کەڵکێکی هەیە؟

ئەوەندەی تا ئێستا زانستی پزیشکی سەلماندویەتی تەنها کەڵکێک کە ئەلکهول هەیبێت بۆ پیاوانی سەرو تەمەنی چل ساڵە کە یارمەتی دڵیان دەدات ئەگەر بە ڕێژەیەکی میانە بیخۆنەوە. ئەو کەڵکەش بەبەراربەرکردن لەگەڵ ئەو هەموو زیانەی کە باسکران وەک دڵۆپە ئاوێک وایە لە دەریایەکدا!

---

[50] Drug Scope [online]

## ئایا ئاستی میانە بۆ خواردنەوەی ئەلکهول چەندەیە؟

ئاستی میانە بۆ خواردنەوەی ئەلکهول بەپێی پێوەری دەوڵەتیی لە شانشینی یەکگرتوو بەم جۆرەیە:

**پیاو 3–4 یەکە لە ڕۆژێکدا**

**ژن 2–3 یەکە لە ڕۆژێکدا.**

یەکەیەکی ئەلکهول 10میلیلیتر ئەلکهولی پوختەیە کە دەکاتە پەرداخێکی مامناوەندی بیرە یان پەرداخێکی بچوک مەی یان پێکێك خواردنەوەی بەهێزی وەك ویسکی.[51]

لە بارەی یاساوە، هەروەك پێشتر باسکرا، ئەلکهول لە شانشینی یەکگرتوو قەدەغە نییە بەڵام تاوانە بدرێت بە منداڵانی زۆر بچوك (لە 5 ساڵ کەمتر)و تا 18 ساڵیش ناتوانن ئەلکهول بکڕن یان لە یانەکاندا بیخۆنەوە. هەروەها لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا یاسای جۆراوجۆر هەیە بۆ سزادانی ئەو کەسانەی کە بەسەرخۆشی ئۆتۆمۆبێل و هۆکارەکانی هاتوچۆ لێدەخوڕن، ئەم یاسایانە هەندێکیان زۆر توندوتیژن و هەندێکی دیکەیان مامناوەندین" بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئۆتۆمۆبێل لێخوڕین بە سەرخۆشی تاوانە ئیتر سزاکەی کەم بێت یان زۆر. لە زۆر شاری بەریتانیادا ئێستا بەپێی یاسای هەرێمی (ناوچەیی) لە زۆربەی ناوچەکانی ناوشارو شەقامەکاندا (لەدەرەوەی یانەو بارەکان) خواردنەوەی ئەلکهول قەدەغەیە بۆ هەموو کەس لەهەر تەمەنێکدا

[51] Office UK, (2004) Substance Misuse and the Workplace. A training pack. P.2.30

بێت. ئەو ناوچانە بە نیشانەی تایبەت دەستنیشانکراون" نمونەی ئەو شارانە وەك شاری بلاکبێرن و باس و کۆڤنتری.

2. هێورکەرەوەکان **Tranquillisers**: ئەمانە ئەو دەرمانانەن کە بەشێوەیەکی گشتی پزیشك دەیاننوسێت بۆ چارەسەری نەخۆشی وەك دڵەڕاوکێ و خەمۆکی و بێخەوی و هتد... نمونەکانیان Diazepam (ڤالیۆم)، Rohypnol، (Mogadon) Nitrazepam، (Ativan)Lorazepam ،Altiva ،Jellies ،Temazepam ، Chlordiazepoxide ،moggies (Librium) وە Flunitrazepam (Rohypnol).



هێورکەرەوە بێهێزەکان جۆرە دەرمانێکن کە لە بنەڕەتدا بۆ مەبەستی چارەسەرکردنی دڵەڕاوکێ و خەمۆکی و پەرکەم بەکاردەهێنرێن و وەکو حەبی خەویش کەڵکیان لێوەردەگیرێت. بەڵام هێورکەرەوە بەهێزەکان بۆ مەبەستی چارەسەری کێشە ژیرییە درێژخایەنەکان بەکاردەهێنرێن، وەك شیزۆفرینیا. ئەم دەرمانانە بەزۆری لەشێوەی حەب و کەپسولدا قووتدەدرێن بەڵام هەندێك جۆریان بەشێوەی دەرزیش بەکاردێن.

دەرمانە هێورکەرەوەکان لە ساڵانی 1960ەکاندا دۆزرانەوەو وەك دەرمانی بێمەترسی و ئالودەنەکەر چاویان لێکرا کە دەتوانرێت لەلایەن پزیشکەکانەوە

بۆ چارەسەرکردنی دڵەڕاوکێو بێخەوی بەکاریهێنرێن. یەکەم جار وەك جێگرەوەیەکی سەلامەتی Barbiturates سەیردەکران.

گەرچی گەلێك کەس، بەتایبەتی ژنان، بەدەست ئاسەوارە لاوەکییەکانی ئەم دەرمانانەوە دەیانناڵاند کەچی بەکارهێنانی ئەم



دەرمانانە بۆ ماوەی 20 ساڵی داهاتوو بەردەوام بوو رە تا کۆتایی ساڵانی 1970 کان ئەم کێشانە بە ئاشکرا گرنگییان پێنەدرا. نوسینی ئەو دەرمانانە بۆ نەخۆش لە زیاتر لە 30 ملیۆن حەبەوە لە ساڵی 1979 دا دابەزی بۆ نیوەی ئەو برە لە کۆتایی 1990ەکاندا. لەگەڵ ئەو هەموو دابەزینەشدا Tranquilisers تا ئێستا باوترین دەرمانی چارەسەرکردنی کێشەی مەزاجن لە شانشینی یەکگرتودا.[51]

Tranquilisers دەرمانێکی ئارامبەخشنو خەلکی خەواڵوو دەکەنو ئەگەری کارەسات زیاتر دەکەن. لەکاتی بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەدا لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل زۆر ترسناکە. لەگەڵ بەکارهێنانی بەردەوامدا ڕاهاتنی لەشی مرۆڤەکە لەگەڵیدا Tolerance بەزووی پێکدێتو بەردەوام پێویستی بەبڕی زیاترە بۆ ئەوەی کاریگەری یەکەمجاری هەبێت. خوگریو ئالودەگیش

---

[51] Drug Scope [Online]

بەهۆی بەکارهێنانی بەردەوامەوە بەزووی دروست دەبن و ئاسەوارەکانی پاشەکشە Withdrwal دەکرێت ببنە هۆی دڵەڕاوکێیەکی زۆر، بێخەوی، دڵبەیەکداهاتن، بێئارامی و سەریەشە. کشانەوەیەکی لەپڕ لە بەکارهێنانی بڕی زۆری ئەو مادانەوە پێدەچێت ببێتە هۆی سەرلێشێوان و بورانەوەی بەهێز. زۆر کەس ناتوانن یەکسەر وازی لێبهێنن و پێویستیان بە کەمکردنەوەی بڕی دەرمانەکە هەیە پلە بە پلە.

ئەوانەی کە بەبەردەوامی ئەم مادانە بەکاردەهێنن دوای ماوەیەک بۆیاندەردەکەوێت کە ناتوانن هەمان ئەنجامی پێشوو بدەنەوە بەدەستەوە. بەکارهێنانی بەردەوام پێدەچێت ئەوە بگەیەنێت کە دوای دوو هەفتە وەک حەبی خەو کاریگەرییان نامێنێت و دوای چوار مانگیش بۆ چارەسەری دڵەڕاوکێ هیچ ئەنجامێك نادەن بەدەستەوە. لەم کاتەدا زۆر لە بەکارهێنەران پەنادەبەنە بەر زیادکردنی بڕی دەرمانەکە. Tranquilisers تەنها وەك دەرمانی چارەسەری دیاردە کاتییەکان کاریگەرییان هەیە بەلام زۆر کەس ئالودەیان بوون و بۆ چەندەها ساڵ بەکاریاندەهێنن.



زۆر لەم مادانە ئەگەر بەبڕی زۆر بەکاربهێنرێن دەبنە هۆی مردن. بەلام گەلێك جاریش بینراوە کە بەهۆی بەکارهێنانیانەوە لەگەڵ ئەلکهولدا بوونەتە هۆی مردن(Temazepam) ئەگەر

بەشێوەی دەرزی بەکاربێت بەشێوەیەکی تایبەت ترسناکەو گەلێك جار بووەتە هۆی مردن، بەتایبەتی کە لەگەڵ دەرمانی هێورکەرەوەی دیکەدا بەکارهاتووە.[53]

لە بەریتانیا بەگوێرەی ئامارەکان هەموو ساڵێك ملیۆنێك تا ملیۆنو نیوێك کەس ئەم مادانەیان وەك چارەسەر بۆ دەنوسرێت. بەمجۆرە واپێشبینی دەکرێت کە ساڵانە لەحەوت کەسی پێگەیشتو یەکێکیان ئەو دەرمانانە بۆ ماوەیەك بەکاردەهێنێتو لە هەر چل کەسەش یەکێکیان بۆ تەواوی ساڵەکە بەکاریدەهێنێت. ئەم بەکارهێنانانە بەپێی ڕەچەتەی پزیشکەو بەردەوام لە دابەزیندایە.

ئەگەرچی هیچ زانیارییەك دەربارەی بەرهەمهێنانی نایاسایی Tranquilisers لەبەردەستدا نییە بەڵام ئەو دەرمانانە بەرەو بازاڕی ڕەش دەکشێنو لەسەر شەقامەکان وەك دەرمانی نایاسایی دەفرۆشرێن.

ئەوەی مەترسییەکە زیاتر دەکات زۆر کەس لەگەڵ دەرمانو مادە هۆشبەرەکانی دیکە تێکەڵیان دەکەنو پێکەوە بەکاریاندەهێنن.

لەبارەی یاساییەوە ئەم دەرمانانە یاساین ئەگەر لەلایەن پزیشکەوە بنوسرێن بۆ نەخۆش. بەڵام بەپێچەوانەوە بەبێ ڕەچەتەی پزیشك قاچاخنو لە بەریتانیا بە دەرمانی پۆلی C پۆلێن کراون.

لە کوردستان بێجگە لە بەکارهێنانی ئەم مادانە بەشێوەی یاسایی لەلایەن پزیشکەکانەوە، بەداخەوە دزەشی کردووە بۆ دەرەوەو پێدەچێت یەکەمجار

---

[53] Drug scope [online]

لەلایەن کارمەندانی تەندروستیەوە خراپ بەکارهاتبن و دواتریش بەرەو ئاستێکی فراوانتر تەشەنەیانکردووە.

## 3.هەڵمژینەکان و سیکۆتینەکان Solvents & Glue

Glue: هەڵمژینەکان و سیکۆتینەکان ئەو مادانەن کە هەروەک لەناوەکەیانەوە دیارە لەڕێگای لوتەوە هەڵدەمژرێن.

ئەم مادانە هەندێکیان بناغەیەکی ئۆرگانیکی ـ واتە کاربۆنیان هەیەو لەکاتی هەڵمژینیاندا کاریگەرییەکی وەك ئەوەی ئەلکهول یان مادەی بەنجکەر دروستدەکەن.

هەندێکیان وەك کالکەرەوەوپووکەرەوە بەکاردێن Solvents لە سیکۆتین، کەتیرە، بۆیە، لابەری بۆیەی نینۆك، شلەمەنی خاوێنکردنەوەی ووشك و شلەمەنییەکانی لابەری چەوریدا. هەندێکی دیکەشیان لەشێوەی گازی پاڵنەردا لە قوتوو (پەمپ) و ئامێری ئاگرکوژاندنەوەکاندا بەکاردێن یان وەك سوتەمەنی لەشێوەی بەنزین و چەرخی جگەرە داگیرساندندا. زۆربەی مالان و کارگەکان و فەرمانگەکان ژمارەیەك بەرهەمی Solvents بەکاردەهێنن کە دەکرێت بۆ هەڵمژین بەکاربێن.[54] ئەم بەرهەمانە هەڵمێکیان لێبەرز دەبێتەوە یان لەژێر پلەی گەرمی ئاساییدا خۆیان گازن و لەڕێگەی دەم یان لوتەوە دەکرێت هەڵبمژرێن و کاریگەرییەکی سەرخۆشکەرانەیان هەبێت. ئەمەش زۆر جار پێی دەوترێت سیکۆتین هەڵمژین یان خراپ بەکارهێنانی Solvents.

---

[54] Drug scope [online]



ئەم دیاردەیە لە عێراقدا لەکاتی هاتنی کرێکارە میسرییەکاندا زۆر بڕەوی هەبوو. واش باس دەکرا کە سیکۆتینی عێراقی کە بە بڕێکی زۆر لە کاتی جەنگی عێراق-ئێراندا بە قاچاخ بەرەو ئێران دەڕۆیشت لەوێندەری بۆ ئەو مەبەستە بەکارهاتبێت.

لە ئەورووپاو ئەمریکاو جیهانی خۆرئاوا بەگشتی گەنجان و هەرزەکاران ئەوانەی کە تەمەنیان لەنێوان 12 تا 16 ساڵاندایە بەزۆری بەکاریان دەهێنن. هەندێك ڕووپێوی وانیشاندەدەن کە 10٪ی خوێندکارانی خوێندنگا دواناوەندییەکان لە شانشینی یەکگرتوو لانی کەم جارێك ئەم مادانەیان بەکارهێناوە.[55]

مەترسی گەورەی Solvents کاتێك ڕوودەدات کە ئەو کەسانەی بۆیەکەم جار ئەو مادانە بەکاردەهێنن بەهۆی نەشارەزایی و ڕانەهاتنی لەشیان و منداڵی تەمەنیانەوە زۆرجار یەکسەر دەمرن.

لە ئەمریکاو ئینگلتەرا هەر لەسەدەی 19 هەمەوە Nitrous Oxide کە بە گازی پێکەنین ناسرابوو بەکارهاتووە لەلایەن ئەندامانی چینە باڵاکان و

---

[55] Ibid

خوێندکارانی زانستی پزیشکییەوە. لەڕابوردودا هەڵمژینی بەنزین لەلایەن سەربازەوە بۆ مەبەستی سەرخۆشبوون و هەڵمژینی گازی بەنج لەلایەن کارمەندانی تەندروستییەوە باسکراوە.[56]

لەڕۆژگاری نوێشدا یەکەمجار لە سالی 1950دا لە ئەمریکا یەکەم خراپ بەکارهێنانی Solvents لەلایەن گەنجانەوە تۆمارکراو لە شانشینی یەککگرتووش لە سالی 1962دا. بەلام لە کۆتایی حەفتاکاندا دیاردەکە تەشەنەی کرد.

ئەو مادانە دوای هەڵمژینیان بەخێرایی لە سییەکاندا هەڵدەمژرێن و دەگەنە مێشک. لێدانی دڵ و هەناسە هێواش دەبنەوە و هەڵمژینی ئەم مادانە بە خێرایی و بەردەوامی کەسەکە والێدەکات کە هەمان نیشانەکانی کەسێکی تەواو سەرخۆشی تێدا دەربکەوێت.



زۆرکەس دوای ئەوە دەبورێنەوە و دواتر هۆشیاندێتەوە و هەندێکیشیان باسی ئەوەیانکردووە کە بینینیان شێواوە و نیشانەکانی هەلوسەو بزرکاندنیان تێدا وەدەرکەوتووە.

کاریگەرییەکانیان کورتخایەنن و زۆربەی جار لە 45 خولەک کەمترن ئەگەر دووبارەنەکرێنەوە.

دوای نەمانی کاریگەرییەکان بەکارهێنەر

[56] Ibid

هەست بە ماندوویی و خەواڵوویی دەکات و تووشی سەریەشەو بێتاقەتییەک دەبێت لەشێوەی ئەوانەی کە ڕۆژی دوای خواردنەوەی ئەلکهول هەستیپێدەکەن Hangover.

بەکارهێنانی بۆماوەی دوورودرێژو بەبڕی زۆر پێدەچێت ببێتەهۆی تێکشکاندنی مێشکو گورچیلەکان و جگەر.

پەیامەکان لەنێو مێشکدا وەک تەزووی کارەبا بە ڕێکوپێکی لە شانەیەکەوە بۆ شانەیەکی دیکە گوزەردەکەن. مادەیەکی چەورەیە پێی دەڵێن Myelin کە دەورەی دەمار یان مولولەکانی داوە هەروەک ئەو مادە پلاستیکییەی کە وایەرێکی کارەبا دادەپۆشێت و لە شۆرت دەیپارێزێت. ئەگەر ئەو مادەیە (Myelin) تێکبشکێت ئەوا پەیام و فەرمانەکان ناتوانن بە ئازادی گوزەربکەن.



ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە چیدیکە ماسولکەکانت ناتوانن گوێڕایەڵی مێشکت بن وەک لەو وێنەیەی خوارەوەدا ڕوونکراوەتەوە:[57]

زۆرجار بەکارهێنەران بیروهۆشیان دەشێوێت و ناتوانن مێشکیان



چەقببەستێتە سەر خاڵێکی دیاریکراو وەک لەو هێلکارییەدا نیشاندراوە:

لەگەڵ بەکارهێنانی بەردەوامدا لەش لەگەڵ ئەومادانەدا ڕادێت Tolerance واتە بەردەوام پێویستی بەبڕی زیاترە بۆ بەدەستهێنانی هەمان مەبەست. لەگەڵ ئەوەشدا خوگری جەستەیی کێشەیەکی ئەوەندە گەورە نییەو دەتوانن بەئاسانی دەستبەرداری ببن بەڵام هەندێك کەسی کەم لەلایەنی سایکۆلۆژییەوە خوی پێوەدەگرن. زۆر لەوانە ئەو گەنجانەن کە کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتی و تاکەکەسییان هەیەو بەکارهێنانی ئەو مادانە وەك ڕاکردنێکی کاتییە لەو واقیعە تاڵە.

---

[57] Real news about drugs and your body [online]

لەبارەی یاساییەوە ئەگەرچی لەبنەڕەتدا ئەو مادانە بۆ پێویستی ڕۆژانەی خەڵك دروستكراون‌و خەڵك خراپ بەكاریانده‌هێنێت بەڵام لە شانشینی یەككگرتودا قەدەغەیە ئەو مادانە بفرۆشیت بە گەنجێكی تەمەن لە 18 ساڵ كەمتر ئەگەر دوكاندارەكە بزانێت بۆ مەبەستی خراپ بەكارهێنان‌و هەڵمژینێتی. ئەمەش تەموملاوی‌و پرگرێوگولەو بەئاسانی ناسەلمێت!

## 4. هیرۆین (ئەفیون، تلیاك) Heroin: لە سەرشەقام‌و

نێوبازاڕدا بە گەلێك ناو ناسراوە وەك: سماك، قاوەیی، سكاگ، ئەسپ، H، گێڕ، جەنك، ستاگ‌و جاك. هیرۆین كە ناوە پزیشكیەكەی دایامۆرفینە Diamorphine یەكێكە لە گروپێكی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەكان كە بە ئەفیونەكان Opiates ناسراون، كە لە





گوڵی ئەفیون یان خاشخاش دەردەهێنرێن. ئەفیون Opium شیری وشككراوەی گوڵە خاشخاشە كە مۆرفین‌و كۆدایتیێدایە. مۆرفین‌و كۆداین هەردوكیان بە مادەی

ئازارشكێنی بەتین ناسراون. هیرۆین لە مۆرفین بەرهەمدێت و لە كاتێكدا كە پوختەیە، وڵتە هیچی دیكەی تێكەڵنەكراوە، لەشێوەی تۆزێكی سپیدایە.[58]

سەرچاوەی سەرەكی ئەو هیرۆینەی كە دەگاتە ئەورووپا ئەو ناوچەیەیە كە بە كەوانەی زێڕین Golden Crescent ناسراوە كە بریتییە لە ناوچە شاخاوییەكانی ئێران و ئەفغانستان و پاكستان كە سەدان ساڵە بە بەرهەمهێنانی هیرۆین یان وەك لەلای خۆمان ناسراوە تلیاك بەناوبانگن. بەگوێرەی راپۆرتی ساڵی 2004ی نوسینگەی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ دەرمان و تاوان تەنها لە ئەفغانستان لەساڵی 2003دا 80000 هیكتار زەوی بۆ چاندنی تلیاك بەكارهاتووە كە 264000 جوتیار كاریانتێدادەكەن، لەكاتێكدا كە لە ساڵی 2002 دا 74000 هیكتار بووە.[59] (لە كۆتایی ئەم كتێبەدا نەخشەیەك دەبینین كە لە ساڵی 1998 لەلایەن یۆنسكۆوە ئامادەكراوە و لەوێدا ناوچە جوگرافییەكانی دابەشبوونی بەرهەمهێنانی گوڵی تلیاك و ڕووەكی كۆكا دیاریكراوە لە جیهاندا.)

لەكوردستان لە مێژە وشەی تلیاك بیستراوە. وشەی تلیاك لە زمانی فارسیدا بە تریاك ناسراوە و بۆ ئەفیون بەكاردێت. لە زمانی عەرەبیدا تریاق هەیە كە مانای دەرمان یان دەرمانی گشت دەردان دەگەیەنێت، پێدەچێت ئەم گوڵە یەكەمجار وەك ئازارشكێن ناسرابێت و ئەو ناوەشی لەوێوە وەرگرتبێت.[60] فەرهەنگی المحیك و گەلێك فەرهەنگی دیكەی عەرەبی وشەی

---

[58] **Drug scope [online]**
[59] **World Drug Report of UNODC [online]**
[60] **Ectaco Dictionary [online]**

تریاقیان بە : ئەو دەرمانەی کە چارەسەری ژاراوی بوون دەکات (دَواءُ شافِعنَ السُّمّ) ناوبردووە.[61] لەڕاستیدا نە بنەچەی وشەکەو نە مەبەستی ناوەکەی ڕوون نییەو ئەم ساخکردنەوەیە جێدەهێڵم بۆ شارەزایانی بواری زمان‌و زانستی نوژداری. بۆ خۆشبەختی بەکارهێنانی ئەم دەرمانە، هەروەك زۆربەی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکانی دیکە لە کوردستاندا نەبووە بە باوو هەتا ئێستاش سەرباری نزیکیمان لە سەرچاوەی بەرهەمهێنانییەوە هێشتا هەر لە وڵاتانی دیکەی ناوچەکە زۆر باشترین.

ناوی گوڵە خاشخاشیش لە نێو قسەی کوردەواریدا زۆر هاتووە وەك: گوڵە خاشخاشەی کردووە بە یەخەیەوە!



واتە زۆر بەختەوەرە یان شادومانە. بەلام لەڕاستیدا پێناچێت ئەو گوڵە هەر گوڵی تلیاك بگرێتەوە چونکە لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی Poppy بۆ هەموو ئەو گوڵانە بەکاردێت کە لە شێوەی گوڵالە سورەدان مەرج نییە هەر تلیاك بێت.

بەکارهێنانی هیرۆین بۆ مەبەستی نوژداری لە شێوەی حەب یان دەرزیدایە. هەندێك جۆری بەشێوەی پیشەسازی بەرهەمهاتووی ئەم مادانەش بۆ مەبەستی پزیشکی بەرهەمهاتووە کە پێیان دەڵێن (Opioids)و هەمان کاریگەری هیرۆینیان هەیە، کە بریتین لە:

---

[61] World Star free dictionaries [online]

dihydrocodeine(DF180), pethidine (کە بەزۆری لە کرداری منداڵبووندا بەکاردێت) ، diconal, palfium, Temgesi, methadone کە دەرمانێکە بەزۆری بۆ مەبەستی چارەسەری ئالودەبوون بە هیرۆینەوە دەنوسرێت.

هیرۆین بەڕێگای کێشان (وەك جگەرە) یان هەڵمژین لەڕێگای لوتەوە یان بەشێوەی دەرزی بەکاردێت. ئەو هیرۆینەش کە بۆ مەبەستی نوژداری بەرهەمدێت زۆرجار لەلایەن خەڵکەوە بۆ مەبەستی نایاسایی بەکاردێن. لە شانشینی یەکگرتوو بەپێی ئامارەکان لە ساڵی 2002دا نرخی گرامێك هیرۆین لە نێوبازاڕدا 60 پاوەند بووە (کە دەکاتە 100 $) وە 75٪ هەموو هیرۆینی ئەورووپا لە ئەفغانستانەوە هاتووە. [62] هیرۆین یەکێکە لەو دەرمانانەی کە لەڕیزی پێشەوەیە لە هۆکاری مردندا بەهۆی دەرمانەوە لە UK. گەلێك ڕێوشوێن تاقیکراوەتەوە بۆ بەرگرتن لە بەرهەمهێنان و چاندنی تلیاك بەڵام بێهودە بووە. چەندەها ملیۆن پاوەند دراوە بە حکومەتی پاکستان بۆ ئەوەی کێڵگەکانی تلیاك لەنێوبەرێت و پشتگیری جوتیارەکان بکات بۆ چاندنی بەرهەمی دیکەی ئاسایی. ئەم ڕێگایە سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە چونکە لەلایەکەوە زۆربەی ئەو ناوچانەی کە ئەو مادانەیان لێدەچێنرێت دوورەدەستن و حکومەت دەستی پێیان ناگات لەلایەکی دیکەشەوە نرخی تلیاك هێندە بەرزە کە هەرشتێکی دیکە بچێنن لەچاو ئەوەدا هیچ نییە، بێجگە لەوەش دەستتێوەردانی حکومەت بە وێرانکردنی چەند کێڵگەیەك تەنها پاڵی پێوەدەنێت بەرەو ناوچەیەکی دیکە و هیچی

[62] National Criminal Intelligence Service, 2003. [online]

تر.[63] کێشەی گەندەڵی دامودەزگاکانی دەوڵەتیش لەو وڵاتانەدا لە سەرو هەموویەوەیەتی.

وەك پێشتر باسکرا تلیاك لە دێرزەمانەوە ناسراوەو وەك دەرمانو چارەسەر بەکارهاتووە. ئەوەش نکولی لێناکرێت کە ئەو مادەیە ڕۆڵی خۆی هەیە لە ئازارشکاندندا بەشێوەیەکی کاتی" بەڵام وەك هەر دەمانێکی دیکە ئەگەر لەژێر چاودێری پزیشکداو بە ڕادەیەکی کۆنتڕۆڵکراو بەکارنەهێنرێت ئەوا دەبێتە ژەهرو ئالودەکەرو زیانبەخش.

تلیاك لەسالانی 1550 وە لە UKو سەرتاپای ئەورووپادا بۆ مەبەستی پزیشکی بەکارهاتووە. لە سەدەی 17هەمەوە دەرمانی وەك Laudanum



[63] Drug scope [online]

که تێکەڵەیەکە لە تلیاكو ئەلکهول بۆ چارەسەری هەموو جۆرە دەردێك بەکارهاتووە وەك شکاندنی ئازاری زۆر، یاریدەدانی خەوتن، کۆکە، سکچوون، ئازاری سورِی مانگانەی ژنان، دانیەشەو سکیەشەو ژانی کۆرپەلە. ئەم بەکارهێنانە بەردەوام بوو تا سەدەی نۆزدەهەمو زۆر دەرمان کە بەرهەمی تلیاك بوون لە دوکانی سەوزەو میوەدا بەئاشکرا دەفرۆشران‌و چەندەها نوسەر وشاعیری بەناوبانگ بەکاریاندەهێنا.[64] بەرزبوونەوەی رێژەی مردنی منداڵانی ساوا بەهۆی زیادبەکارهێنانی ئەو مادانەوە بووەهۆی دروستکردنی ترس‌و دڵەراوکەو لە ئەنجامدا لە ساڵی 1868دا یەکەم یاسای کۆنترۆڵکردنی ئەفیون دەرچوو.لە ئەمریکا پەنابەرە چینییەکان بە بڵاوکردنەوەو پەرەپێدانی تلیاك تاوانبارکرابون. لەراستیدا لەو کاتەدا گەلێك کەس ئالودەی ئەو مادەیە بووبوون لە ئەمریکا بەڵام ئەو مەسەلەیە بنچینەیەکی



---

[64] Ibid

ڕەگەزپەرستانەشی هەبوو" هەر ئەو وێنە درێژە بوو کە بووە هۆی پێوەلکاندنی مۆرکێکی ڕەگەزپەرستی بە چینییەکانەوە لە ئەمریکاو بەریتانیاش.[65]

ناوەڕاستی 1970کان پەرەسەندنێکی بەرچاوی بازاڕی هیرۆینی بەشێوەیەکی نایاسایی بەرهەمهاتووی بەخۆیەوە بینی کە لە هۆنگکۆنگەوە دەهات. لەناوەڕاستی 1980کانیشدا ژمارەی بەکارهێنەرانی هیرۆین‌و مادە تلیاکییەکانی دیکە لە بەریتانیا بەشێوەیەکی سەرنجراکێش زیادیکرد بەتایبەتی لە ناوچە هەژارنشینەکانی نێوەندی شارەکاندا. ئەم هیرۆینە لە ناوچەی کەوانەی زێڕینی ئێران، پاکستان‌و تورکیاوە دەهات. ئەو شێوەیەی هیرۆین کە بۆ کێشان ئامادەکراوە نەك دەرزی، دوای بەرزبوونەوەی ژمارەی پەنابەرە ئێرانییەکان بۆ بەریتانیا دوا بەدوای



[65] Drug scope [online]

ڕوخانی شا ساڵی 1979وەدەرکەوت.[66]

لە دێرزەمانەوە لە ئێران تلیاك بەکارهاتووە، پڕوپاگەندەکردن بۆ تلیاك وەك دەرمانی گشت دەردان و بەهێزترین ئازارشکێن و شادیهێنەرو خەمڕەوێن زۆر برەوی هەبووەو هەیە. ئەوانەی کە خۆیان ئالودەن یان ڕوونتربڵێین قاچاخچی ئەو مادەیەن حەزدەکەن بازاڕ بۆ خۆیان فراوانبکەن و ڕەواج بە بازرگانییە دزێوەکەیان بدەن. کاتێکیش ئەو کەسە ئالودەبوو ئیتر دەبێت



ئەو بەدوای قاچاخچییەکەدا بگەڕێت و مەمنونی ببێت! لەسەردەمی شادا بەئاشکرا لەسەر شەقامەکان دەفرۆشراو دوای هاتنی کۆماری ئیسلامیش پەردەیەکی درابەسەرداو لەپشت پەردەوە هەر برەوی هەیە" ئەگەرچی گەلێك

[66] Heroin Addiction and Drug Policy: the British system, J. Strang and M. Gossop (eds), Oxford Univeristy Press, 1994.

ڕێوشوێن گیراوەتە بەر بۆ بەرەنگاربوونەوەی. کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی، وەك کاربەدەستانی زۆربەی وڵاتانی جیهان، هۆکاری ئەوە دەگێڕنەوە بۆ هەبوونی ژمارەیەکی زۆری پەنابەری ئەفغانی لە وڵاتەکەیاندا.[67] بێگومان ئەوە هۆکارێکە بەڵام هۆکاری سەرەکی ئەوەیە کە بێجگە لەوەی کە سەرەڕێی کاروانی قاچاخچێتی دەرمانە، تلیاك لەکۆنەوە بەشێك بووە لە کولتورو ژیانی ڕۆژانەی زۆر ناوچەی ئەو وڵاتە.[68]

هیرۆین و جۆرەکانی دیکەی تلیاك یان ئەفیون جۆرە دەرمانێکن کە مرۆڤ خەواڵو دەکەن و کۆئەندامی دەمار هێمن دەکەنەوە. بزوتنەکانی لەش هێواش دەکەنەوەو دەتوانن دەردو ئازاری جەستەیی و دەرونی بشکێنن، یان ڕوونتر بڵێین نەهێڵن هەستی پێبکرێت. کاریگەرییەکانیان بەشێوەیەکی گشتی پێکهێنانی هەستکردن بە گەرمبوونەوەو حەوانەوەو گوێنەدان بەهیچ شتێك و کەمبوونەوەی دڵەڕاوکێییە. کاریگەرییەکانی بە خێرایی دەردەکەون و دەکرێت بۆ چەند کاتژمێرێك بمێننەوە، ئەمەش بەگوێرەی چەندایەتی بڕی دەرمانەکەو جۆری بەکارهێنانی دەگۆڕێت.

**یەکێك لە بەکارهێنەران بە مجۆرە دەدوێت:**

" پێدەچێت یەکێك لە ساتە هەرە خۆشەکانی ژیانم بووبێت. هیچ ئازارێك لەلەشمدا نەما.

هیچ هەستێکی تووڕەییم نەما، لەسەر قەنەفەکە پاڵکەوتبووم و بەوپەڕی بەختەوەرییەوە مژم لێدەدا.

---

[67] UNODC-Iran Country Office [online]
[68] Christian Olive. Reuters, 3 January 2004. Bam, Iran. [online]

**واتلیدەکات هەست بە ئارامی و گەرمبوونەوەیەك بکەیت هەروەکو لە پەتۆیەکەوە پێچرابیت." [69]**

بەکارهێنانی بۆ یەکەمجار رەنگە ببێتە هۆی سەرگێژخواردن و رشانەوە بەلام ئەم کاردانەوە ناخۆشانە لەگەڵ بەکارهێنانی بەردەوامدا بەرەو نەمان دەچن. ئەگەر ئەو کەسە بڕێکی زۆر بەکاربهێنێت ئەوا زۆر خەواڵوو دەبێت. بڕی زۆر بەیەکجار دەبێتە هۆی لەهۆشخۆچوون و بورانەوەو تەنانەت مردنیش بەهۆی لەکارکەوتنی کۆئەندامی هەناسەوەلەگەڵ بەکارهێنانی بەردەوامدا لەش لەگەڵیدا ڕادێت و بەردەوام داوای بڕی زیاتر دەکات بۆئەوەی کاریگەری یەکەمجاری بدات بەدەستەوە. لەشی مرۆڤەکە لەلایەنی جەستەییەوە ئالودەی دەبێت و کۆنترۆڵکردنی ئەستەم دەبێت. ئەگەر ئەو کەسە بەکارینەهێنێت یان دەستی نەکەوێت نیشانەکانی پاشەکشەی تێدا دەردەکەوێت کە بریتین لە ئازار، لەرزین، ئارەقکردنەوە، لەرزلێهاتن وەك ئەوەی هەلامەتی بێت و گرژبوونی ماسولکەکان. ئەم نیشانانە پێدەچێت دوای 10-7 رۆژ نەمێنن بەلام هەستکردن بە بێهێزی و نەخۆشی رەنگە زیاتر بخایەنێت. لەکاتێکدا زۆر کەس بەسەرکەوتویی وازیان لە بەکارهێنانی هیرۆین هێناوە، تەرککردن و وازهێنان لە هیرۆین لەوانەیە زۆر سەخت بێت.

ئەو وێنەیەی خوارەوە کاریگەرییەکانی هیرۆین لەسەر مێشك ڕووندەکاتەوەو هۆکارەکانی ئالودەگی و ناڕەحەتییەکانی پاشەکشە دەخاتە ڕوو. لەوێدا ڕوونکراوەتەوە کە چۆن هیرۆین دەلکێت بەو شانانەی مێشکەوە کە بە نیرۆن ناسراون لە چەندەها شوێنی مێشکداو دەبنە هۆی دەرکردنی

[69] Drug Scope [online]

بانگەوازێك بۆ زیاتر پڕاندنی مادەی دۆپامین Dopamine کە مادەیەکی کیمیاوی مێشکەو پەیوەندی هەیە بە هەستکردن بە خۆشییەوە. ئەم کارەش دەبێتە هۆی ووروژاندنی چەندەها کاردانەوە لە شوێنی جیا جیای مێشکدا.

هەروەها هیرۆین دەبێتە هۆی خێراکرنی ئەو پرۆسانەی مێشك کە لێپرسراون بەرانبەر هەستو ئەست بە خۆشیی، بە کارکردنە سەر Limbic System " ئەمەش وا لەوانە دەکات کە ئالودەبوون بەو دەرمانەوە بەناچاری بەدوایدا بگەڕێن. هیرۆین کاردەکاتە سەر درکە مۆخو لێرەدایە کە کاریگەری هەیە وەك ئازارشکێن، چونکە دەبێتە بەربەستێك لەبەردەم پەیامەکانی هەست بە ئازارکردندا لەنێوان دەمارەکانو مێشکداو ناهێڵێت بگەنە مێشك. هەروەها هیرۆین کاردەکاتە سەر قەدی سەرەکی مێشك Brain Stem کە لێپرسراوە بەرانبەر کردارە بنچینەییەکانی لەش وەك لێدانی دڵو هەناسەدان "لێرەدا دەتوانێت کرداری هەناسەدان ئەوەندە دابلۆسێنێت تا ئەو رادەیەی کە بەکارهێنەر بەتەواوی هەناسەی لەبەردەبڕێتو دەمرێت:[70] یەکێك لەوانەی کە پێشتر بەکارهێنەر بووە دەڵێت:



[70] **Real News About Drugs and Your Body [Online]**

" بەخێرایی ئالودەی دەبیت و هەست بەوە دەکەیت کە دەبێت هەمیشە بەکاریبهێنیت. لەگەڵ هەموو جۆرە خەوش وخۆڵ و زبڵێکدا تێکەڵی دەکەن بەڵام لەڕاستیدا تۆ گوێنادەیتێ. تاکە ئامانجی ژیانت دەبێت بە بەدەستهێنانی بڕێکی زیاتر. بەجۆرێك بوو کە هەموو هەست و هۆشی داگیرکردبووم."[71]

هیرۆین مەترسی کوژەری هەیە ئەگەر بەبڕێکی زۆر بەکاربێت، یاخود لەگەڵ دەرمان و مادە هۆشبەرەکانی دیکەدا تێکەڵبکرێت وەك ئەلکهول و ترانکیولایزەر و جۆرەکانی دیکە.

بەئاسانی ناتوانرێت بزانرێت ئەو کەسە چی بەکارهێناوە چونکە ڕادەی پوختەیی هیرۆین لەبازاڕدا جۆراوجۆرە و بەزۆری لەگەڵ مادەی دیکەدا تێکەڵدەکرێت و هیرۆینی بێخەوش زۆرکەمە بەهۆی بەرزی نرخییەوە. لەڕاستیدا بینراوە کە لەگەڵ گلوکۆز، پۆدرەی منداڵ، ووردەی خشت، تۆزی بەهارات و شتی دیکەشدا تێکەڵکراوە.[72]

لەم نێوەدا بەکارهێنانی لەڕێگای دەرزییەوە زۆر ترسناکە بەهۆی ئەو مادە نامۆیانەوە و هەروەها بەکارهێنەران دەخاتە بەر مەترسی



گرفتاربوون بە زەردوویی و HIV

[71] Drug Scope [online]
[72] Home Office UK, (2004) Substance misuse and the Workplace. A training Pack.

ئایدز ئەگەر سرنج لەنێوان چەند کەسێکدا ئاڵوگۆڕپکرێت. بەکارهێنانی هیرۆین

بەبەردەوامی دەبێتە هۆی قەبزی بەردەوام و ناڕێکوپێکی سوڕی مانگانە لە ژناندا و هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە و کەمبوونەوەی بەرگری لەش بۆ نەخۆشی.

ئەمەش خراپتر دەبێت بەهۆی شوێن وجێگەورێگەی خراپ و پیس و کەمخۆراکی و پشتگوێخستنی پاکوخاوێنی کەسەکەوە" ئەم هەلومەرجانەش لەلای زۆربەی بەکارهێنەران بەوجۆرەیە:



ئەوانــەی کــە بەشــێوەی دەرزی بەکاریــدەهێنن ئەگــەری تێکــشکانی دەمارەکانی خوێن‌و پەککەوتنی سییەکان‌و دڵیان هەیە. بـەکارهێنانی هـەموو جۆرەکـانی تلیـاک‌و هیرۆیـن لـەکاتی سـکپڕیدا دەبێتـە هـۆی کۆرپـەلـەی کـەم کـێش‌و ئـەو کۆرپەلانـەش دوای لـەدایك بـوون نیـشانەکانی پاشەکـشەیان پێوەدیارە. وازهێنان‌و تـەرککردنی تلیـاك لـەکاتی سـکپڕیدا زۆر ترسـناکە بـۆ کۆرپەلەکە، هەرلەبەرئەوەیە کە پاشەکشەی پلەبەپلـەو کـەم کـەمی دایکەکـە بەباش دەزانرێت تا منداڵەکەی دەبێت.

لەبەرئەوەی ئاسـەوارەکانی پاشەکـشە زۆر سـەختە چـەندەها قوتابخانـەی چارەسەرکردنی ئالودەگی بە هیرۆین دامەزراوە. لە UK ئاژانسی نیـشتمانی چارەسـەر NTA سیاسـەتێکی چارەسـەرکردنی بـۆ ئینگلتـەرە داڕشـتووە. وەکو بەشێك لە ستراتیژی نیشتمانی دەرمان، ئامانجیان ئەوەیە کە تا سـاڵی 2008 بتوانن ژمارەی چارەسەرکراوەکان بکەن بە دوو ئەوەنـدە. میـسۆدین Methadone سەرقافڵەی ئەو دەرمانانەیە کە بۆ چارەسەرو ڕاهێنانەوەی بەکارهێنەرانی هیرۆین بـەکاردێت. Buprenorphine لـە نیـسانی 2001 ەوە لەلایەن پزیشکەکانەوە دەنوسرێت‌و لەکاتێکدا بـەکاردێت کـە میـسۆدین باشــترین چــارە نــەبێت" بــۆ نمونــە کاتێــك کەسەکە لە قۆناغی سەرەتایی خوگریدا بێت.



بــەهۆی بــەکارهێنانی دەرزی‌و ســـرنجەوە لەنێوان چەندەها کەسداو زیاتر تەشـەنەکردنی HIV ئایدز بیر لە کردنەوەی بنکـەی تایبـەت کرایەوە بۆ ئاڵوگۆڕی سرنج. لەم کاتەدا

بەکارهێنەران سرنجە بەکارهاتووەکان دەگێڕنەوە بۆ بنکەکەو لەبەرانبەردا سرنجی نوێو بەکارنەهاتوو وەردەگرن بە خۆڕایی. ئەم سیاسەتە لەپێناوی تەندروستی گشتیدایەو ئەگەرچی لەسەرەتادا زۆر کەس پێشوازی لێنەدەکردو ولیان دەدایە قەڵەم کە ئەوە ڕێخۆشکردنو ئافەرینکردنی بەکارهێنەرانە، بەڵام دواتر ڕوونبوەوە کە ئەوە سیاسەتێکی نوژداری دروستە چونکە بەکارهێنەران زیاتر دێنە ژێر باری کەمکردنەوەی مەترسیو کۆنترۆڵو چارەسەرکردن.

لەلایەنی یاساییەوە هیرۆین لە پۆلی A دا پۆلێن کراوە لە UKو ئێستا پۆلیس بەپێی یاسای دەرمانی 2005 ڕێگەیانپێدراوە هەرکەسێك دەستگیر بکەنو گومانی ئەوەی لێبکرێت کە دەرمانی پۆلی A بەکارهێناوە بەبێ ڕەزامەندی خۆی پشکنینی دەرمانی بۆبکەنو ئەگەر پۆزەتیف دەرچوو ئەوا پێویستە بچێتە کۆرسی تایبەتی چارەسەرکردنەوەو پابەندی دیدارەکانی دواتر بێت.[73] هەروەها پۆلیس دەتوانێت تیشکی ئێکس بۆ ئەو قاچاخچیانە بگرێت کە دەرمان لەناوەوەی لەشیاندا دەشارنەوەو شایانی باسیشە ئەوەی ڕاستەخۆ هیرۆین بەکاربهێنێت هەتاکو 24–48 کاتژمێر لەوەدوا لە ڕێگای پشکنینی میزەوە دەردەکەوێت.

[73] Drugs Act 2005 [online]

# هەلوەسەهێنەرەکان Hallucinogens

LSD .1: LSD (Lysergic Acid Diethylamide) دەرمانێکی هەلوەسەهێنەرەو لە بنەڕەتدا لە مادەی Ergot دەردەهێنرێت کە لە ژار یان کەڕوو دروستدەبێت کە لەسەر ڕووەکی چاودار یان چۆدان Rye (کە پێدەچێت پەرشە بێت)و هەندێک ڕووەکی دیکە دروستدەبێت. لەشێوەی تۆزێکی سپیدایە بەلام لە بازاڕو سەرشەقامەکان (وەک دەرمانی نایاسایی) لەشێوەی شلەمەنییەکدایە کە هەروەکو خۆی بەتەنها یاخود ڕژێنراوە بەسەر پارچەکاغەزدلو هەلیمژیوە.

پارچەکاغەزەکان کراون بە پارچەی وورد ووردەوە لەشێوەی پولی پۆستەداو بەزۆری وێنە یان کلێشەیان لەسەرە. LSD هەندێکجار دەدلۆپێنرێتو دەکرێت بە کلۆ شەکری شەشپالوویی یاخود لەشێوەی حەبو کەپسولی بچوکدا دروستدەکرێت. بۆئەوەی کاریگەری هەبێت لەسەر کەسێک تەنها ئەندازەیەکی زۆر بچوک پێویستەو بەلام بەهێزی LSD جۆراوجۆرو جیاوازە. بەشێوەیەکی گشتی لەڕێگای دەمەوە بەکاردێت. لەنێوبازاڕو سەرشەقامەکاندا بەگەلێك ناوەوە ناسراوە وەك: ئەسید، خۆشی، دلۆپ، تیشکی هێواشکەرەوە، ترشەلۆکی شل، قارچکی کاغەز، ئەستێرە، شەکر، خەیال، پەنجەرەو گەلێك ناوی دیکە...

LSD یەکەمجار لەساڵی 1938دا لەلایەن کیمیاگەرێکی توێژینەوەکارەوە دۆزرایەوە کە ناوی ئەلبێرت هۆفمان بوو، کە سەرقاڵی دۆزینەوەی دەرمانی نوێ بوو. لە ساڵی 1943دا خۆی کەوتە ژێر کاریگەری خەیاڵێکی LSDەوە لەرێگای هەڵەوە کاتێك لە تاقیگەکەیدا خەریکی ئەزمونکردن بوو.

ئەو بەمجۆرە باسی خەیاڵبوونەکەی دەکات:

" هەینی رابوردوو، 16ی نیسانی 1943، ناچاربووم دەست لەکارەکەم هەڵبگرم لە تاقیگەکەدا لە ناوەراستی پاشنیوەرۆداو رووەمکردە ماڵەوە، چونکە چوبوومە ژێرکاریگەری بێئارامییەکی بێوێنەوە کە تۆزێك لەگەڵیشیدا گێژبووبووم. لە ماڵەوە پاڵکەوتمو لە بارێکدا نقوم بووم کە لەشێوەی سەرخۆشییەکدا بوو کە بەلامەوە ناخۆش نەبوو، لە شێوەی هەست بە وریابوونەوەو وروژانێکی بێهاوتادابوو. لەبارێکی وەك خەونبینیندا، بە چاوی نوقاوەوە، تەوژمێکی لەیەکنەپچراوی وێنەی سەیروسەمەرە، شێوەی نائاسایی و عەجایب، کە چەندەها رەنگ بەشێوەیەکی سەرسورهێنەر دەهاتنو دەچون بەبەرچاومدا گوزەری دەکرد. دوای دوو کاتژمێرێك ئەم بارە نەماو ئاسایی بوەوە." [74]

لەسالانی 1950کانو 1960کاندا پزیشکەکان لە ئەمریکاو UK ئەم مادەیەیان بۆ چارەسەری هەندێك لە نەخۆشانی دەرونیو زیری بەکاردەهێنا بۆ وەبیرهێنانەوەی هەستو بیرە کپکراوەکانیان. هەروەها بەشێوەیەکی ناسەرکەوتوانە لەلایەن سوپای ئەمریکییەوە بەکارهات بۆ زانیاری هەڵهێنجان لە لەشکرەکانی دوژمن لەکاتی لێکۆڵینەوەدا وەك "دەرمانی

[74] Albert Hofmann. 'LSD: My problem child,' McGraw Hill 1980.

ڕاستگۆیی"و هەروەها وەك دەرمانێك کە هیچنەبێت لەکاتی شەڕدا دوژمن تووشی سەرلێشێوان بکات. لەسەرەتای سالانی 1960کاندا خەڵك بۆ خۆشیو ڕابواردن دەستیاندایە تاقیکردنەوەی LSD . لەنێو گروپە هیپیو دابڕاوەکاندا LSD تەنانەت وەك شێوازێکی ڕێوڕەسمی ئاینیش چاویلێدەکراو وەك ڕێگایەك بۆ دەست گەیشتن بە خود، خەڵکانی دیکەو ژینگە. دەستەلاتداران دژی بەکارهێنانی ڕاوەستانو لەسالی 1966دا بەکارهێنانی LSD لە UK قەدەغەکرا. بەهۆی ناوبانگی خراپی ئەم دەرمانەوە، بەکارهێنانی لە بواری پزیشکیشدا ڕاوەستێنرا بەپێی بڕیاری خراپ بەکارهێنانی دەرمانی سالی 1973.[75]

لەسالانی 1970 کانو 1980کاندا بەکارهێنانی LSD زۆر کەمبووەوە بەلام جارێکی دیکە لە سەرەتای 1990ەکاندا لەنێو کۆڕی گەنجاندا سەریهەلدایەوە.

(LSD) دەرمانێکی هەلوەسەهێنەرە واتە بەکارهێنەرانی دەکەونە بارێکی نائاساییەوەو وادەستدەکەن کە شتی سەیروسەمەرەو ناڕاست دەبینن‌و دەبیستن. ئەم بارە نائاسایە کار لە هەموو هەستەکانیان دەکاتو دەکەونە خەیالێکەوە لە جیهانی واقیعی دووریاندەخاتەوە. بەکارهێنەرانی LSD بەو خەیالبوونە دەلێن گەشتو نیو کاتژمێر دوای بەکارهێنانی دەرمانەکە دەستپێدەکاتو دەکرێت تا 20 کاتژمێر بخایەنێت. کاریگەری LSD بەپێی ڕادەی دەرمانەکەو باری دەروونیو سۆزداری بەکارهێنەر دەگۆڕێت لەکاتی بەکارهێنانی دەرمانەکەدا.

بەکارهێنەران بەزۆری باسی ئەوەیانکردووە کە بینینیان شێواوە وەك بینینی ڕەنگی زۆرو ئالۆزو شێوەو

---

[75] **Drug Scope [online]**

ئەندازەی ناناساییەو جوڵانو بزوتنی شمەکی بێگیانو بێجوڵە. گۆڕانی دەنگو گۆڕانکاری لە هەستکردن بە کاتو شوێنیش لە دیاردە باوەکانی بەکارهێنەرانی ئەم دەرمانەن.

یەکێك لەبەکارهێنەران دەڵێت:

**" یەکەمین گەشتم زۆر خۆشبوو. گوڵەکان سەریاندەرهێنابوو زۆر سەرنجڕاکێش بوون. هەموو شتێك لەدەوروبەرم جوانو وەك کریستاڵ ڕوونبوون. خۆم بەبەختەوەرو هاوڕێو هاوسۆز دەزانی چ لەگەڵ خۆمو چ لەگەڵ جیهانی دەوروبەرم."[76]**

هەستو سۆزەکان زۆر لەیەك جیاوازن. هەندێك کەس واباسدەکەن کە زۆر هەستیاربوون بەرانبەر خۆیانو خەڵکی دیکەو دەڵێن گەشتی LSD وەکو ئەزمونێکی ئاینی یان گیانی وابووە. هەستکردن بە جیابوونەوە لە جەستەش زۆر باوە لەگەڵ ئەم دەرمانەدا. ئەگەر بەکارهێنەرەکە خەمی شتێکی بێتو لە دڵەڕاوکێدا بێت یان توشی خەمۆکی بوبێت ئەوا هەستکردن بەترسو بێتاقەتی ئەگەری زیاتریان هەیە.

---

[76] Ibid

بەکارهێنەرەکە ڕەنگە بکەوێتە باری تۆقینو پارانۆیاوە Paranoia ( ئەوە بارێکی دەروونی یان ژیرییە کە ئەو کەسە بەشێوەیەکی ناڕاست واهەستدەکات خەڵکانی دیکە دەیانەوێت ئازاری بدەنو ئەو گەلێك گرنگەو خەڵك دەیانەوێت ژێر بەژێر پلانی لەدژ بگێڕن) بەتایبەتی لە دەوروبەری نەشازو لە هەلومەرجی پاشاگەردانیو بێسەروبەریدا. ئەو ڕاستییەی کە کاتێك ئەو کەسە LSD ی بەکارهێنا ئیتر گەڕانەوە ئەستەمە بۆ باری ئاسایی تا بەتەواوی دەرمانەکە کاریگەری نامێنێتو بەریدەدات (ئەو بارەش بەپێی چەندایەتی دەرمانەکە دەگۆڕێت کە دەکرێت 12 کاتژمێر یان زیاتر بێت)، وا دەگەیەنێت کە ئەگەری گەشتێکی ناخۆش زۆر نزیکە. گەشتی ناخۆش ئەو گەشتەیە کە بەکارهێنەر هەست بە شتی ناخۆش دەکاتو دەکەوێتە نێو ئەزمونێکی ناخۆشەوە، وەك بە کوردی دەڵێن: خراپ گرتویەتی! هەمان کەس پێدەچێت بە ئەزمونی خۆشو ناخۆشدا تێبپەڕێت لە باری جیاجیادا یان تەنانەت لە هەمان گەشتیشدا. ڕادەی بەهێزی دەرمانەکەش لێکجیاوازەو زۆر نارەحەتە بزانیت ئەو بڕەی کە وەریگرتووە چەند بووە. ئەگەر بەکارهێنەران تووشی دڵەڕوکێ ببن ئەوا کەسانی دیکە دەتوانن هێوریان بکەنەوە، یان بەپێچەوانەوە ئەوەندەی دیکە تێکیانبدەن.

لەکاتی گەشتدا چەقبەستنی مێشك زۆر گرانەو زۆر ترسناکیشە ئەگەر ئەو کەسە ئۆتۆمۆبێل لێبخوڕێت یان ئامێر کارپێبکات. بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە نییە کە LSD بوبێتە هۆی خوگری لەلایەنی جەستییەوەو یان بەهۆی زۆری بڕی مادەکەوە کەسەکە مردبێت، ئەگەرچی بەهۆی ئەو کارەساتانەوە کە لەژێر کاریگەری دەرمانەکەدا ڕویاندلوە خەڵك مردون. هەندێك لە

بەکارهێنەران باسی ئەو دیاردەیەیان کردووە کە بە فلاشباك ناسراوە" لێرەدا ئەو کەسە جارێکی دیکە دەکەوێتەوە ژێر کاریگەری ئەو بەسەرهاتەوە کە پێشتر ڕوویداوە.

لەم بارەدا ماوەی فلاشباکەکە کورتە بەلام زۆر پەشێوکەرە ئەگەر ئەو کەسە نەزانێت کە شتی لەو بابەتە هەیە.

زۆربەی بەکارهێنەران ڕۆژانە بەکاریناهێنن، تاڕادەیەك لەبەرئەوەی وادیارە بڕی زیاتر کاریگەری نەبێت ئەگەر چەند ڕۆژێکی نەکەوێتە نێوانەوە. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرکەس ئەوەندە بەردەوام بەکاریدەهێنن کە بەتەواوی لە جیهانی واقیعی دادەبڕێن.

لە شەستەکاندا ترسی ئەوە بلاوبووەتەوە کە گوایە LSD کرۆمۆسۆمەکان تێکدەدات و مندالانی پاشەڕۆژی بەکارهێنەران دەشێوێنێت، بەلام بۆ ئەو مەسەلەیە هیچ بەلگەیەك بەدەستەوە نییە.[I]

لەبارەی یاساییەوە LSD دەرمانێکە لە پۆلی A و ئێستاکە هیچ جۆرە بەکارهێنانێکی پزیشکی نییە هەربۆیە بەهەموو جۆرێك قاچاخە. واتە لە UK بەهەرکەسێك بگیرێت 7 ساڵ زیندانی دەکرێت و بارمتەش دەکرێت، ئەگەر ئەوکەسە بیفرۆشێت یان دابینیبکات ئەوا زیندانی هەتا هەتایی و بارمتەش دەکرێت.

---

[77] Ibid

2. DMT ناوە کیمیاوییەکەی dimethyltriptamineو ئەمیش هەروەک LSD دەرمانێکی هەلوسەهێنەرە بەلام دەلێن گوایە لەو بەهێزترە. دەتوانرێت بەڕێگای دەرزی، کێشان یان هەلمژینەوە بەکاربێت. کاریگەرییەکانی ئەم دەرمانە کورتخایەنن کەمجار لە 2 کاتژمێر زیاتر دەخایەنن. ئەم دەرمانەش لە گەلێك جۆرە ڕووەك دەردەهێنرێت وەك *Phalaris aquatica*و arundinacea.






ئەم دەرمانەش لە پۆلی A پۆلێنکراوە.

3. قارچکی ئەفسوناوی Magic Mushroom: ئەمانە ئەو جۆرە قارچکانەن کە کاریگەری هەلوسەهێنەریان هەیەو بەشێوەیەکی کێوی لەزۆر شوێنی جیهان دەڕوێن لە پایزدا. جۆری سەرەکییان کە بەکاردێت ئەو جۆرەیە کە پێیدەلێن

کڵاوی ئازادی Liberty cap یان *Psilocybe semilanceata* بەڵام ئەو جۆرەش کە پێیدەڵێن Fly agaric یان Amanita Muscaria هەندێك جار بەکاردێت.

قارچکی ئەفسوناوی بە گەلێك ناو ناسراوە لە نێو بازاڕو سەرشەقامەکاندا وەك: ئازادییەکان، ئەفسونەکان، موشی، کڵاوی ئازادی‌و هتد... هەموو جۆرەکانی قارچکی ئەفسوناوی بێجگە لە Fly agaric بەشێوەیەکی گشتی بە کاڵی دەخورێن، بەڵام وشکیش دەکرێنەوەو هەڵدەگیرێن بۆئەوەی دوایی بەکاربهێنرێن. دەتوانرێت بکوڵێنرێن‌و بکرێن بەخۆراك یان بکرێن بەجۆرێك لە چا یان شلەمەنی‌و بخورێنەوە. 20-30 قارچکی کڵاوی ئازادی بە ژەمێکی تەولو دادەنرێن، بەڵام یەك دانە یان لەتێك لە جۆری Fly agaric بەسە بۆ ژەمێك.[78]

ژمارەیەکی زۆر ڕووەکی هەلوسەهێنەرو قارچك لەلایەن خێڵە کۆنەکان‌و شارستانییە دێرینەکانەوە بەکارهاتووە وەك ڕێبازێك بۆ چونە نێو جیهانی گیانەوە Spiritual World . قارچکی Fly agaric لەلایەن حەکیمەکان یان پیاوچاکانی (ئەوانەی دوعا بۆ خەڵك دەکەن یان بۆیاندەپاڕێنەوە) لە باکوری خۆرهەڵاتی ئاسیاو سیبریاوە بەکارهاتوون. قارچکی جۆری کڵاوی ئازادی لەلایەن گەلی ئازتێکەوە Aztecs لە مەکسیك وەکو مەستیهێنەری پیرۆز چاوپانلێکراوە لەو سەردەمەدا کە ئیسپانییەکان ئەوێیان داگیرکردووە لە سالانی 1500 ەکاندا. ئەم قارچکانە لە مێژووی

[78] Drug Scope [online]



ئەورووپادا جێگایەکی ئەوتۆیان نییە، ئەگەرچی ئەفسونگەرە کۆنەکان بەکاریان هێناون. بەکارهێنانی قارچکی ئەفسوناوی لە UK بۆ مەبەستیشادیهێنەر دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی 1970کان وەکو جێگرەوەیەکی یاسایی بۆ LSD. بەکارهێنانی جۆری Fly agaric تا ئێستاش دەگمەنە بەڵام بەکارهێنانی جۆری کڵاوی ئازادی زۆر باوە بەتایبەتی لەنێو گەنجاندا.

کاریگەری کڵاوی ئازادی وەکو کاریگەری ژەمێکی بچوکی LSD وایە وەهەروەها بەپێی مەزاجی ئەوکەسەو باری دەرونیو پێشبینییەکانی بۆ ئەو دەرمانە، زۆر دەگۆڕێن.

کاریگەرییەکانی دوای نیو کاتژمێر دەردەکەونو بۆ ماوەی تا 9 کاتژمێر دەمێننەوە، ئەمەش پشت بەوە دەبەستێت کە چەند دانە بەکارهاتووە. بەکارهێنەران زۆربەی جار زۆر پێدەکەنو زۆر هەست بە متمانەبەخۆبوون دەکەن. هەندێك کەسیش سەرێانگێژدەخواتو دەرشێنەوەو ناوسکیان دێشێت. خواردنی بڕێکی زۆر دەبێتە هۆی گەشتێکی بچوك یان مامناوەندی بە شێوانی دەنگو بینینیشەوە.

گەشتی خراپ یان ناخۆش زۆر تۆقێنەرەو پێدەچێت ترس، دڵەڕاوکێو پارانۆیا بگرێتەوە. ئەمە کاتێك ئەگەری زیاترە کە ئەو کەسە بڕێکی زۆری خواردبێت یان ئەگەر خۆی لەخۆیدا لە ترسو دڵەڕاوکێدا بێت. ئەو کەسانەی کە دەکەونە گەشتی ناخۆشەوە دەکرێت بەهۆی کەسانی دەورووبەریانەوە

هێوربکرێنەوە. ماوەیەك لەوەدواش هەروەك لە LSD دا ڕوودەدات، پێدەچێت فلاشباك ڕووبدات و ئەو کەسە هەرلەخۆیەوە جارێکی دیکە بکەوێتەوە ئەو گەشتە ناخۆشەوە ئەمەش زۆر تۆقێنەرە بەتایبەتی بۆ کەسێك کە چاوەڕوانی شتێکی وەها نەبێت. پاش ماوەیەك هەموو ئەم خەیاڵ و بیرکردنەوانەیان لە هزردا دەسڕێتەوە.

یەکێك لەوانەی تووشی ئەم گەشتە ناخۆشانە بووە دەڵێت:

**" هەر لەپڕ دیوارەکان دەستیانکرد بە سوڕانەوە، ویستم کۆتایی پێبێت بەڵام کاتێك دەستت پێکرد ئەستەمە بتوانیت ڕایبوەستێنیت. لەڕاستیدا بەڵایەکی گەورەبوو بەسەر کەللەی سەرمەوە."** [79]

مەترسی هەرە گەورە لەوەدایە کە کەسێك بە هەڵە جۆرێك قارچکی ژاراوی بخوات و وابزانێت ئەوەیە. هەندێك جۆر قارچك هەن کە بەڕاستی کوژەرن وەك Amanita Phalloides، Amanita Virosa. [80]

قارچکی ئەفسوناوی، هەروەك LSD لەشی مرۆڤ بەخێرایی لەگەڵیدا ڕادێت و بەمجۆرە بۆ ڕۆژی دووەم ئەو کەسە پێویستی بە دوو ئەوەندە قارچکی جۆری کڵاوی ئازادییە بۆ ئەوەی هەمان کاریگەری یەکەمجاری هەبێت. ئەگەرچی مرۆڤ لەلایەنی جەستەییەوە خوی پێوەناگرێت و ئەگەر بەکاربهێنێت هەست بە ئاسەوارەکانی پاشەکشە ناکات پاش بەکارهێنانیشی بە بەردەوامی، بەڵام زۆر کەس لەلایەنی سایکۆلۆژییەوە خوی پێوەدەگرن و بەردەوام حەز بە بەکارهێنانی دەکەن. تا ئێستاکە بەڵگەی

[79] Drug Scope [online]
[80] Ibid

ئەوە بەدەستەوە نییە كە بەكارهێنانی بۆ ماوەی دووورودرێژو بەردەوام ببێتە هۆی مەترسی تەندروستی گەورەو جیددی. لەگەڵ بەكارهێنانی Fly agaric دا ئەگەری كاریگەری خراپ زیاترە، وەك سەرگێژخواردنو ڕشانەوە، ڕەقبوونی جومگەكانو لەدەستدانی هاوكێشەی لەش. بەكارهێنانی بڕێكی زۆر لەم مادەیە (هەرچەندێك بێت زیاتر لە یەك قارچكی Fly agaric) ڕەنگە ببێتە هۆی خۆوونكردنێكی تەواو (واتە ئەو كەسە نازانێت كێییەو بۆكوێ دەچێتو چی دەكات)و ق لێهاتنو هەندێك جاریش مردن.

بەكارهێنانی قارچكی ئەفسوناوی لە سكۆتلەندو وێڵز گەلێك بڵاوە لە ئینگلتەرەش لەنێو گەنجاندا برەوی هەیە. لەلایەنی یاساییەوە لە گەلێك وڵاتی جیاجیادا یاسای جۆراوجۆر هەیە لە پەیوەندیدا بە قارچكی ئەفسوناوییەوە. لەم دوایانەدا حكومەتی فیدراڵی ئەمریكی یاساكانی زۆر توندوتیژكردەوە لەدژی دەرمانو مادە هۆشبەرەكان بە گشتی، بە قارچكی ئەفسوناویشەوە. لەزۆر وڵات قارچكی ئەفسوناوی بە تەڕوتازەیی قەدەغە نییە بەڵام بە وشككراوەییو ئامادەكراوی زۆر قەدەغەیە.

لە هۆڵەندا تا ساڵی 2002 نە قارچكی تەڕو نەووشك قەدەغە نەبوو بەڵام لە بەرواری 4ی نۆڤەمبەری 2002 ەوە جۆری ووشككراوە قەدەغە كرا.[81]

لە UK تا ساڵی 2005 جۆری تەڕ قەدەغە نەبوو بەڵام بەپێی یاسای دەرمانی 2005 هەموو جۆرە قارچكێكی ئەفسوناوی كە مادەی psilocin یان ester of psilocin ی تێدابێت لە UK قەدەغەو یاساغە ئیتر تەڕو

[81] Psilocybe Magic Mushrooms and the law- legal issues. [online]

تازە بێت یان ووشککراوەو ئامادەکراو.[82] قارچکی ئەفسوناوی لە UK بە دەرمانی جۆری پۆلی A پۆلێنکراوە ئەگەر لەو جۆرانە بێت کە باسکران.
پۆلیسی هەرێمی نۆهیۆ لە USA دەست دەگرێت بەسەر بڕێکی زۆر قارچکی ئەفسوناویدا:



4. کانەبیس (حەشیش) : کانەبیس یەکێکە لەو دەرمانانەی کە زۆر بڵاوەو زۆریشی لەسەر نوسراوەو لەگەلێك شوێنیش تا ئێستا جێگای مشتومڕی یاسایی‌و ئەدگارییە بۆ قەدەغەکردن یان ڕێپێدان. کانەبیس لەسەر شەقامو

[82] Drugs Act 2005 C.17 [online]

ناوبازاڕدا بەگەلێك ناو ناسراوە وەك: حەشیش، کانەبیس، بژار، ڕەش، گیا، هاش، ڕووەك، مارەوانا، مەنجەڵ، تیشکەکانی باکور، کەتیرە، دوکەڵ، سفرو هتد.کانەبیس یان حەشیش ڕووەکێکە کە لە گەلێك شوێنی ئەم جیهانە بەشێوەیەکی کێوی دەڕوێت و بەئاسانی لە کەش و هەوای وەك کەشوهەوای UK دا گەشەدەکات و وەبەردێت. هەندێك ناوی ئەم ڕووەکە بەناوی ئەو شوێنەوە ناو نراوە کە لە بنەڕەتدا لێوەی هاتووە وەك جۆری ئەفغانی، کۆلۆمبی، لوبنانی، مەغریبی، پاکستانی و بەریتانی و هتد... تەنانەت وشەی Assassin کە لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ ڕەشەکوژی و غافڵکوژی بەکاردێت لە بنەڕەتدا لە وشەی حەشاشین (حەشیشییەکان یان حەشیشخۆرەکان)ەوە هاتووەو دواتر لەسەر زمانی ئەوان بووە بە ئەساسین و وەك تاکە وشەی زمانی ئینگلیزی بۆ ئەو مەبەستە لەنێو فەرهەنگی زماندا جێگایەکی بۆ خۆی گرتووە. ئەو کۆمەڵە حەشیشخۆرە پیاوکوژەش کۆمەڵێك شیعەی ئیسماعیلیی بوون لە سەدەی یازدەهەمدا (بۆزانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی ـــ تیرۆریزم:چونە نێو ناخی دیاردەیەکی جیهانییەوە–جۆرەکانی تیرۆریزم. و. عەتای مەلا کەریم) کانەبیس لە پەلکی ڕووەکی حەشیش یان کانەبیس دەردەکرێت، کە ڕوەکێکی قەرەباڵغ و پەلوپۆدارە. چالاکترین پێکهاتەی کانەبیس مادەی tetrahydrocannabinols (THC) ە کە ئەوانەش ئەو مادە کیمیاویانەن کە کاردەکەنە سەر مێشك. جۆری جیاجیای کانەبیس لە بەشی جیاجیای ڕووەکەکەوە دەردەهێنرێت و کاریگەری جیاوازیشیان هەیە. حەشیش یان وەك خۆیان دەڵێن هاش Hash بڵاوترین جۆریانە کە لە UK دەبینرێت. ئەوەش ئەو مادە کەتیرەییەیە کە بەهۆی ووردوخاشکردن

یان وولینی پەلکی ووشککراوەی ڕووەکەکەوە دەردەهێنرێتو دوای ئەوەش لەشێوەی قالبی قاوەییو ڕەشدا کەبس دەکرێت. ئەو قالبانەش بەزۆری لە مەغریب، پاکستان، لوبنانو ئەفغانستان یان نیپالەوە دەهێنرێ UK. کانەبیسی گیاییش لە گەڵای جنراوو وشککراوەی ڕووەکەکەوە ئامادەدەکرێت.

ئەوەش بەنێوی گیا، پەلکو gangaو لە ئەمریکاش بە مارەوانا marijuana ناسراوەو لە ئەفریکا، ئەمریکای باشور، تایلەند، ناوچە هیندییە خۆرئاواییەکانەوە دەهێنرێت.

هەندێك بڕی کانەبیس لەنێو وڵاتی بەریتانیادا وەبەردێت، هەندێك جار بەبڕی زۆر بۆ فرۆشتن بەڵام بەزۆری تاکەکەسەکان لە ماڵی خۆیاندا یان لە خانوی شوشەدا بەرهەمیدەهێنن بۆ مەبەستی بەکارهێنانی تایبەتی خۆیان.[83]



کانەبیسی گیایی بەشێوەیەکی گشتی ئەوەندەی شێوازی کەتیرەیی بەهێز نییە. بەڵام لەگەڵئەوەشدا هەندێك شێوازی زۆر بەهێزی کانەبیسی گیایی لەم دواییانەدا لە هۆڵەنداو بەریتانیا بەرهەمهاتووە.

ڕۆنی کانەبیس زۆر بەکەمی لە UK دەبینرێت کە ئەویش بەهۆی چۆڕاندنەوەی مادەیەکی ڕوونکەرەوە یان کالکەرەوەوە

[83] Drug Scope [online]

بەسەر مادەکەتیرەییەکەدا بەرهەمدێت. حەشیشی جۆری ڕەنگ سوری لوبنانی بەمجۆرەی خوارەوە ئامادەدەکرێت:







یەکەمجار گەڵا کانەبیسەکان ڕنەدەکرێن دوای ئەوەش بەرهەمەکەی زیاتر دەهاڕرێتو لەبێژنگ دەدرێت تادەبێت بە تۆز. لەئەنجامیشدا کەبس دەکرێت لەشێوەی قاڵب یان گونکدا.[]

بەڵام حەشیشی نیپاڵی بەمجۆرە ئامادەدەکرێت:

مادە کەتیرەییەکە دەوەرێتو دوای ئەوەش لەسەر دەست کۆدەکرێتەوەو لە ئەنجامیشدا دەشێلرێت تادەبێت بە هەویر:[]







لە بەریتانیا کانەبیس بەشێوەیەکی گشتی دەکێشرێت" مادەکە لەنێو سیغاردا دەپێچرێتەوە یان لەگەڵ توتندا تێکەڵدەکرێت. شێوەی گیاییەکەی

---

[84] Drug Scope [online]
[85] Ibid

هەندێکجار دەکرێت بە جگەرە بەبێ توتن. هەندێکجار کانەبیس لە سەبیلدا دەکێشرێت، لێدەنرێتو دەکرێت بەجۆرە چایەك یان دەکوڵێنرێتو دەکرێت بە کێك.

لە چەندەها سەدە لەمەوبەرەوە تا ئەمڕۆ لە بەریتانیا پەلکی کانەبیس گوریس، پەت، حەسیر، پۆشاك، ڕۆنی چێشتلێنان، سوتەمەنی، تۆوی ماسی، ئارایشت، چارەسەری گیایی، بۆیەو وارنیشی لێدروستکراوەو دەکرێت. ئێستاکە لە بەریتانیا کێڵگەی تایبەت هەیە بە چاندنی کانەبیس بۆ ئەو مەبەستانە بەڵام لەژێر چاودێری ووردی دەوڵەتدا.

کانەبیس یەکێکە لەودەرمانانەی کە لەکۆنەوە بۆ مەبەستی پزیشکی ناسراوە. لەکۆنەوە لەلایەن چینییەکانو هیندییەکانو خەڵکی ناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستەوە بۆ مەبەستی چارەسەری پزیشکی، بۆ دروستکردنی جلوبەرگو گونیەو گوریس، بۆ مەبەستی بۆنەو ئاهەنگە ئاینییەکانو بۆ ڕابواردنو خۆشی بەکارهاتووە. یەکەمجاریش وەك دەرمانێك بۆ چارەسەری ئازار بەتایبەتی ئازاری منداڵبوونو سوڕی مانگانە لە ئەورووپا بەکارهاتووە. واباسدەکرێت کە پزیشکێك کە خۆی لە هیندستان کاریکردووە هێنابێتی بۆ ئەورووپا. پروپاگەندەی ئەوە هەیە کە شاژنە ڤیکتۆریای ئینگلتەرە دوکتۆرەکەی ئەم دەرمانەی بۆ نوسیبێت.[86] بەکارهێنانی کانەبیس لە UK بۆ مەبەستی ناپزیشکیو ڕابواردن یەکەمجار لە ساڵی 1928دا قەدەغەکرا، دوای ئەوەی نوێنەرانی باشووری ئەفریکاو میسر لە کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتیدا دەربارەی ئەفیون دەوڵەتەکانی دیکەیان دڵنیاکردەوە کە

---

[86] **Drug Scope [online]**

کانەبیس خەڵکی شێتکردووە.[87] ئەو بیرۆکەیەی کە کانەبیس خەڵکی شێتکردووە لە ساڵانی 1930 ەکان و 1940 ەکاندا لە ئەمریکا برەوێکی باشی هەبووە. گەلێك بابەتی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا لەسەر نوسراوەو تەنانەت فیلمیشی لەسەر دەرکراوە بۆ ئەوەی خەڵك باوەڕبێبکەن کە کانەبیس دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەکارهێنەرانی تاوانی گەورە ئەنجامبدەن.

لەو سەردەمەدا کانەبیس لە UK زۆر بەکەمی بەکاردەهات و تا ناوەڕاستی 1960 ەکانیش بەکارهێنانی تەنها بەندبوو بە لایەنگرانی میوزیکی جاز لە لەندەن و هەندێك کۆمەڵی خەڵکی ناوچە هیندییە خۆرئاواییەکان. بەڵام لە ساڵانی 1960 ەکاندا بەکارهێنانی بەخێرایی زیادیکرد بە تایبەتی لەنێو خوێندکارە لاوەکانی زانکۆو کۆلێجەکاندا. لە 1973دا حکومەتی بەریتانی فەرمانیدا کە کانەبیس نابێت لەلایەن پزیشکەوە بۆ نەخۆش بنوسرێت چونکە کەڵکی نوژداری نییە.[88] لەڕاستیدا دوای تێپەڕینی 1960 ەکان بەکارهێنانی کانەبیس لەلایەن هیپییەکانەوە ئەو گرنگییە میدیاییەی نەما تا ناوەڕاستی 1970کان و دوای ئەوەش لە 1990 ەکاندا کاتێك بەکارهێنانی دەرمان بەشێوەیەکی گشتی لەنێو گەنجاندا لە UK پەرەیسەند.



کێشانی کانەبیس دەبێتە هۆی ژمارەیەك کاریگەری جەستەیی وەك زیادبوونی لێدانی دڵ، دابەزینی پەستانی خوێن، سورهەڵگەڕانی چاو، زیادبوونی ئارەزووی خواردن و جاروبار گێژبوونیش.

[87] Ibid.
[88] Ibid

کاریگەرییـەکانی دوای چـەند خولـەکێك دەردەکـەونو پێدەچێتـچەندەها کاتـژمێر بمێننـەوە، بـەگوێرەی بـڕی ئـەو مادەیـەی کـە وەرگـیراوە. ئەگـەر بخورێـت ئـەوا کاریگەرییـەکانی درەنگـتر دەردەکـەون بـەڵام ڕەنگـە زیـاتر بمێننەوە. خواردنی کانەبیس پێدەچێت واتای ئەوە بگەیەنێت کە بڕێکـی زۆر لەو دەرمانە بەیەك جار وەرگیراوەو لەمبارەشدا زۆر سەختە بتوانیت خۆت لە دەرئەنجامە خراپەکانی بپارێزیت.

کانەبیس کاریگەرییەکی هێمنکەرەوەی کەمی تێدایە بەڵام ئـەو کاریگەرییـە بەگوێرەی مەزاجی کەسـەکەو چاوەڕوانیو پێشبینیان بـۆ ئـەو دەرمانـە زۆر جۆرلو جۆرو جیاوازە. زۆر کەس وا هەست دەکەن کە یەکـەمجار کانەبیـسیان بەکارهێناوە هیچ شتێکی ئەوتۆ ڕوینەداوە. بەشێوەیەکی گـشتی کانـەبیس وا لە خەڵکی دەکات کە بحەوێنەوە. پێدەچێت قاقـا پێبکـەنو چـەنەبازبن یـان بەپێچەوانەوە بێدەنگو مات بن. زۆر جـار بەکارهێنـەران ووتویانـە کـە زیـاتر هۆشیار بوون بەرانبەر میوزیكو ڕەنگەکانو کاتیش دەڵێیـت لـەجێگای خـۆی ڕاوەستاوەو نابزوێت.

گەنجێکی کوردی دانیشتوی بەریتانیا ئاوا باسی بەسەرهاتەکە دەکات:

**" ئەوماڵە گەلێك کەسی لێبوو. هەموویان قاقا پێدەکەنین مژیان لـە جەگەرەکانیان دەداو زیاتر پێدەکەنین. مـن سـەرم سـوڕمابوو، هـەرگیز شـتی ئـەوتۆم نـەبینیبوو. ووتیـان ئەمـە دەرمـانی پێکەنینـە، یەکـسەر دەتهێنێتە پێکەنین. یەکێکیان فەرمووی کردمو بەرلـەوەی مـن بڵێم ئـا یان نـەو یـەکێکی دیکە لەوبـەری ژوورەکەوە ووتـی: دیـارە دەترسـیت هیچ نییە بەسەری تۆ تەنها دەرمانی پێکەنینە."**

كاتێك ئەو كەسە لە ژێر كاریگەری كانەبیسدایە بیری كورتخایەنی وەك یادهاتنەوەی ئەوەی كە یەكسەر چی ڕوویداوە یان بیری لە چی كردۆتەوە پێدەچێت كاریتێبكرێت، بەڵام كاتێك كاریگەرییەكانی كانەبیس نامێنێت ئەو بیرهاتنەوەیەش دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی. ئەو كەسانەی كە لەژێر كاریگەری كانەبیسدان كۆنترۆڵیان پێدەچێت تێكبچێتو لەمكاتەدا ئەگەری كارەسات زیاترە، بەتایبەتی ئەگەر ئۆتۆمۆبێل لێبخوڕن یان ئامێرو ئامراز كارپێبكەن.

نەمانی شەرم مانای ئەوەیە ئەو كەسانە پێدەچێت بكەونە هەڵوێستی سێكسی ئەوتۆوە كە دوایی لێی پەشیمان بنو ئەگەری سێكسی مەترسیدارو نا ئەمان واتە بەبێ بەكارهێنانی كۆندۆم زیاترە.[89]

كانەبیس هەندێك كەس دەخاتە دڵەڕاوكێو ترسو تۆقینو پارانۆیدەوەو واهەست دەكەن كە هەموو كەس دژیانە. ئەم بارە لەو كەسانەدا ئەگەری زیاترە كە یەكەمجاریانە بەكاریدەهێنن یان خۆیان لەخۆیاندا لە ترسو دڵەڕاوكێدان یاخود جۆری بەهێزو بڕی زۆریان وەرگرتووە.

ئەگەر ئەو كەسانەی كە خۆیان باری دەروونیی یان ژیرییان تەواو نییە بڕێكی زۆر بەكاربهێنن پێدەچێت بیانخاتە هەلومەرجێكی زۆر ئاڵۆزو پڕتەنگوچەڵەمەوە.

بەڵگەی یەكلاكەرەوە بەدەستەوە نییە كە بەكارهێنانێكی ماناوەندیو دوورودرێژی كانەبیس بووبێتە هۆی تێكچوونو داڕمانی جەستەیی یان دەروونی بەردەوام. بەڵام زۆر نزیكە كە بەردەوام هەڵمژینی دوكەڵی كانەبیس

---

[89] **Drug Scope [online]**

بەدرێژایی چەندەها ساڵ ببێتە هۆی نەخۆشی ڕێچکەکانی هەواو کێشەکانی دیکەی کۆئەندامی هەناسەدان و ئەگەری شێرپەنجەی سییەکان و بەشەکانی کۆئەندامی هەرس. ئەگەری مەترسییەکان زۆر زیاترە ئەگەر کانەبیس لەگەڵ توتندا بکێشرێت. زۆر کەس دەڵێن زیانەکانیان وەك یەکەو هەندێکی دیکە دەڵێن زیانی دوکەڵی کانەبیس زۆرترە(بێگومان لێرەدا مەبەست هەر دوکەڵەکەیەتی نەك کاریگەرییەکانی دیکەی لەسەر مێشك وەك دەرمانێك) .

تا ئێستا ڕوون نییە کە کامیان (دوکەڵی توتن و کانەبیس) زیاتر وێرانکەرە ئەگەرچی ئەوانەی کانەبیس دەکێشن وادیارە قووڵتر هەڵیدەمژن و کانەبیس ئەو جۆرە قەت انانەی زیاتر تێدایە کە دەبنە هۆی شێرپەنجە.[90] بەبڕوای کاتی بایلی لە USA، کاریگەرییەکانی کانەبیس لەسەر مێشك نابێت پشتگوێبخرێن. ئەو هەست بەخۆشیکردنەی بەکارهێنەرانی کانەبیس یان ماریوانا Marijuana بەهۆی مادەی tetrahydrocannabinols (THC) ەوەیە کە لەو ڕووەکەدایەو وەك پێشتر باسیکرا بەهێزترین توخمێتی لەسەر مێشك. بەڵام ئەو توخمە کیمیاوییە لایەنی نێگەتیفیشی هەیە، کاتێك ئەو کەسە ئەو دەرمانە دەکێشێت THC بەپەلە بەنێو سوڕی خوێندا بەرەو مێشك گەشت دەکات. لێرەدایە کە کێشەکە دەقەومێت. لەنێو مێشکی هەر کەسەدا شانەی تایبەتی وەرگر هەیە، کە پێیان دەڵێن وەرگری cannabinoid ، کە لە چەندەها شوێنی گرنگی مێشکدا جێگیرن بەو شوێنەشەوە کە لە بیرو هۆشی ئێمە بەرپرسیارە. THC دەنوسێت بە

---

[90] Ibid

وەرگری (cannabin)ەوەو کاردەکاتە سەر کارکردنی ئبە بەرگرتن لە گواستنەوەی پەیامەکان.[91]

وەك لەو هێڵکارییەدا ڕوونکراوەتەوە:




ئاسایی مێشك خوگری جەستەیی نەسەلماوە بۆ بەکارهێنانی کانەبیس، ئەوانەی کە بەردەوام کێشاویانەو دواتر وازیانلێهێناوە نیشانەکانی پاشەکشەیان پێوەدیارنەبووە بەو شێوەیەی کە لە دەرمانێکی وەك هیرۆیندا هەیە. ئەگەرچی بەکارهێنەرانی بەردەوام لەلایەنی سایکۆلۆژییەوە خوییپێوەدەگرن و بۆئەوەی ڕۆژەکەیان بەسەر بەرن پشت بە کانەبیس کێشان دەبەستن.[92]

---

[91] **Real News About Drugs and Your Body. [online]**
[92] **Drug Scope [online]**

بەلام دوکتۆر گلێن هانسن بەڕێوەبەری پەیمانگای نیشتمانی بۆ مەبەستی خراپبەکارهێنانی دەرمان NIDA لە ئەمریکا لەوباوەڕەدایە کە کانەبیس، یان وەك ئەمریکییەکان دەڵێن ماریوانا، خوگرو بگرە ئالودەکەریشە. ئەو دەڵێت: " **من گاڵتەم بەوە دێت کە دەڵێن ئالودەکەر نییە، مەگەر بڵاوترین دەرمانی نایاسایی نییە کە لەلای ئێمە بەکاربێت.**"[93]

ئەگەرچی دوکتۆر هانسن هۆشیارە کە هەرکەس ئەو مادەیەی کێشا ئالودە نابێت بەلام ئەوەشی ڕوونکردۆتەوە کە زۆر کەس سوێیان دەبێتەوە بۆ دەرمانەکەو کە دەستیان ناکەوێت نیشانەکان پاشەکشەیان لێوەدەردەکەوێت. ئەو بەمجۆرە کۆتایی بە قسەکانی دەهێنێت: " بەلای منەوە ئەوە پێناسەی ئالودەگییە"[94]

هەندێك کەس دەڵێن گوایە بەکارهێنانی کانەبیس دەبێتە هۆی کێشەی دەرونی کە بە "نەخۆشی دەرونی کانەبیس" ناسراوە. لەڕاستیدا بەکارهێنانی کانەبیس دەتوانێت باری دەرونی ئەو کەسانە خراپتر بکات کە کێشەی وەك شیزۆفرینیایان هەیە. بەلام بەڵگەی دڵنیاکەرەوە لەبەردەستدا نییە کە بەکارهێنانی کانەبیس ببێتە هۆی دروستبوونی ئەو جۆرە کێشانە. بەڵگە نەسەلمێنراوەکان وا دەگەیەنن کە جۆری Skunk پێدەچێت بەرپرسیار بێت لە "نەخۆشی دەرونی کانەبیس"، بەلام ئەم بیردۆزەیەش بەتەواوی نەسەلمێنراوە. ئەوەی کێشەکە دروستدەکات پێدەچێت مەسەلەی

---

[93] Real News About Drugs and Your Body. [online]
[94] Ibid

بەهێزی مادەکە بێت، چونکە Skunk چەندەها ئەوەندەی کانەبیسی ئاسایی بەهێزترە.[95]

کەسێك کە بەزۆری کانەبیس بەکاردەهێنێت پێدەچێت ماندوو بێتاقەت و بێهێز دیاربێت و لە کارو خوێندندا تەمەڵ و کەمبەرهەم بێت. ئەم بارودۆخە رەنگە چەندەها هەفتە بەردەوام بێت دوای راگرتنی دەرمانەکە. ئەگەرچی ئەو بارە دەگمەنە و لەو بارە دەچێت کە لە کەسێك چاوەڕواندەکرێت کە ئەلکهول زۆر دەخواتەوە یان بەبەردەوامی حەبی هێورکەرەوە دەخوات.

زۆر کەس ووتویانە بەکارهێنانی کانەبیس دەبێتە هۆی رۆیشتن بەرەو دەرمانە بەهێزەکانی وەك هیرۆین و کۆکاین. زۆربەی ئەوانەی کە هیرۆین و کۆکاین بەکاردەهێنن کانەبیسیان بەکارهێناوە بەڵام زۆربەی ئەوانەی کە کانەبیسیان بەکارهێناوە هیرۆین و کۆکاینیان بەکار نەهێناوە. بە شێوەیەکی دیکە بڵێین، کانەبیس بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی نابێتە هۆی بەکارهێنانی دەرمانی دیکە.[96]

## ئایا کانەبیس کەڵکی پزیشکی هەیە؟

کانەبیس لە دێر زەمانەوە بۆ مەبەستی چارەسەری پزیشکیی میللی بەکارهاتووە (بڕوانە: مێژووی بەکارهێنانی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان). لە بەریتانیاش تا ساڵی 1973 بەکارهێنانی بۆ مەبەستی پزیشکی میللی قەدەغە نەبوو. لەو کاتەوە لە ئەمریکاو بەریتانیا گرنگییەکی زۆر دراوە بە لایەنە نوژدارییەکانی بەکارهێنانی کانەبیس بۆ گەلێك مەبەستی پزیشکی وەك

---

[95] Drug Scope [online]
[96] Ibid

ڕەبــوو، گلاوکۆمـــا، چارەســـەرکردنی ئـــازاری بـــەهێزو لاوان، گرژبـــوونی ماسـولکەکان‌و کێشەکانی مـەزاج. ئـەو دۆزینـەوە نوێیانـەش سـەبارەت بـە وەرگـری cannabinoid ئەگـەری ئـەوە دروسـتدەکەن کـە پێدەچـێت کانەبیس کاریگەر بێت بۆ چارەسـەرکردنی ژمارەیـەك شێوانی سـایکۆلۆژی‌و جەستەیی.

ئەندامە تاکەکانی پیشەی پزیشکی‌و کۆمەڵەی نوژدارانی بـەریتانی BMA پشتیوانی خۆیان بۆ هەڵمەتی بەکارهێنانی کانـەبیس بـۆ مەبەسـتی پزیـشکی دەربڕیوە. بێگومان BMA پشتیوانی ئەوە ناکات کـە کانـەبیس بەشـێوەی کێـشان بنوسـرێت بـۆ نـەخۆش بـەڵکو دەبێـت بەشـێوەیەکی پزیـشکی ئامادەبکرێـت‌و نەخۆشـەکان بۆمەبەسـتی دیـاریکراو کـەڵکی لێـوەربگرن. کۆمیتەی دیاریکراوی ئەنجومـەنی لۆردەکـانیش لـە سـاڵی 1998دا گەیـشتە هەمان دەرەنجام دەربارەی کانەبیس.[97]

لەسـەر ئاسـتی نێودەوڵـەتیش گـەلێك توێژینـەوە بەدەسـتەوەیە بـۆ دەستنیشانکردنی بەرهەمـەکانی کانـەبیس‌و چۆنێتی گۆڕینیـان بـۆ دەرمـانی پزیشکی بەسود. لە داهاتودا پێدەچێت یاساکان گۆڕانکاریان بەسـەردا بێـت‌و ڕێگابدرێت بە پزیشکەکان کە کانـەبیس بـۆ نـەخۆش بنوسـن بـۆ چارەسـەری نەخۆشی بەشێوەی جیاواز لە کێشان" پێدەچێت لەشێوەی حەب، هەڵمـژین، سپرای، بەکارهێنانی لەسەر پێست‌و لە ڕێگای کۆمەوە هتد... شـتێکی دوورە کە کانەبیس بەڕێگای کێشان بکرێت بە دەرمانی نوژداری. حکومەت و BMA لە بەریتانیا لەوباوەڕەدان کە زۆر ئەستەمە بەڕێگای

[97] Drug Scope [online]

کێشان بتوانیت ژەمی پزیشکی لێئامادەبکەیت، لەکاتێکدا کە ژمارەیەك مادەی شێرپەنجەییو قەترانو مادەی ژاراوی تێدایە کە دەبنە هۆی تێکشکاندنی تەندروستیو هێنانە کایەی شێواندنی باری مەزاجو هەڵسوکەوت. کێشەیەکی تر مەسەلەی کۆنترۆڵکردنو بەڕێوەبردنی دەرمانەکەیە وەك دەرمانێکی نوژداریو ناکرێت هەر بەهۆی لایەنە پۆزەتیفەکانییەوە لایەنە نێگەتیفەکانی فەرامۆشبکەینو خەڵکانێك کە ڕەنگە بۆ مەبەستی چارەسەری پزیشکی دەستی بدەنێ کاتێك بەخۆیان بزانن خوییەکی تەواویان پێوەگرتووە.

ئامادەکردنی دەرمانی نوژداری لە کانەبیس تا ئێستا بە شێوەیەکی یاسایی نەکەوتۆتە بازاڕەوە. دەرمانسازانی GW کە تایبەتمەندن بە ئامادەکردنی دەرمانی نوژداری لە کانەبیس ئەزمونە کلینیکییەکانی خۆیان تەواوکردووە لەسەر ئامادەکردنی جۆرە سپرایەك کە پێیدەڵێن دەرمانی Sativex ، بەلام ئەو دەرمانەش جارێکی دیکە چاوەڕوانی ڕێگەپێدانی یاساییە.[98]

لەلایەنی یاساییەوە لە UKو گەلێك شوێنی دیکەی ئەورووپادا مشتومڕی لەسەرە. زۆر کەس دەڵێن پێویستە کانەبیس بەشێوەیەکی سنووردار ئازادبکرێتو هەندێکی دیکەش دەڵێن نەخێر. لە 29ی کانونی دووەمی 2004دا لە بەریتانیا یاساکانی لەمەڕ کانەبیس گۆڕانکارییان بەسەردا هاتو کانەبیس گوێزرایەوە بۆ پۆلی C بەلام بەم مەرجانە:

---

[98] Ibid

- ❖ کانەبیس هەر وەك دەرمانێکی نایاسایی دەمێنێتەوە.
- ❖ هەلگرتن‌و هەبوونی کانەبیس لەلات هێشتا هەر تاوانە.
- ❖ پۆلیس دەتوانێت ئەوانە دەستگیر بکات کە لە شوێنە گشتییەکان، نزیك قوتابخانەو خوێندنگاکان یان بەئاشکرا لەبەرچاوی پۆلیسەکە کانەبیس دەکێشن. هەروەها ئەوانەش دەستگیر دەکەن کە پێشینەی تاوانبارییان هەیە یان پێشتر هۆشیارییان دراوەتێ. ئەوانەش کە تەمەنیان لە 17 ساڵ‌و کەمترە ناتوانن بیکێشن.
- ❖ ئەوەی کە کانەبیسی پێبێت ئەوپەڕی سزاکەی لە 5 ساڵەوە کرا بە 2 ساڵ.
- ❖ بەلام ئەوەی بازرگانی پێوەبکات واتە دابینیبکات‌و بیفرۆشێت، سزاکەی لە 5 ساڵەوە کرا بە 14 ساڵ زیندانی. شایانی باسە ئەم یاسا نوێیە بۆ سزای بازرگانیکردن وقاچاخچێتی پێوەکردنی هەموو دەرمانەکانی دیکەی پۆلیC یش دەگرێتەوە.

لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەشدا لە 19ی ئازاری 2005دا وەزیری ناوخۆی بەریتانی چارلس کلارك لە نامەیەکدا بۆ ئەنجومەنی ڕاوێژکاری خراپ بەکارهێنانی دەرمان ACMD دەنوسێت کە ئەگەرچی ڕێگەشلکردن بۆ کانەبیس نەبووەتە هۆی زیاتر بەکارهێنانی ئەو دەرمانە بەلام بەگوێرەی لێکۆڵینەوەی فێرگسن لە نیوزلەندە لە ساڵی 2004دا بۆیان دەرکەوتووە کە بەکارهێنانی کانەبیس بەشێوەیەکی بەردەوام دەبێتە هۆی زیادکردنی ئەگەری مەترسی دەرکەوتنی ئاسەواری نەخۆشی دەرونی لە قۆناغەکانی دواتری ژیاندا. هەروەها ڕاپۆرتێکی نوێتری پرۆفیسۆر Os لە زانکۆی

ماستریکت لە 2004دا ئەو بۆچوونەی دووبارەکردۆتەوەو زیاتر لەسەر کاریگەرییەکانی لەسەر گەنجان چەقیبەستووە.

هەروەها کلارك سوپاسی ئەو هەولانە دەکات بۆ دەستنیشانکردنی ئەو جۆرانەی کانەبیس کە رادەی بەرز Tetrahydrocannabinol (THC) تێدایەو بەتایبەتی جۆری ناسراو بە skunk . هەروەها ئەوەش دووپاتدەکاتەوە کە حکومەتی هۆڵەندیش دەرکی بەو راستییەکردووەو لە بیری ئەوەدان کە ئەو کانەبیسەی کە زۆر بەهێزە لە پۆلێکی بەرزتردا دابنرێن.لەکۆتاییدا سوپاسی ACMD دەکات بۆ هەولەکانیان و داوایان لێدەکات کە لە دەرەنجامی توێژینەوەکانیان ئاگاداری بکەنەوە.[99]

هەموو ئەم لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو بەدواداچونانە ئاماژە بۆ ئەوەدەکەن کە کانەبیس دەرمانێکی بێمەترسی نییەو ئەگەرچی پێدەچێت بکرێت بۆ مەبەستی نۆژداریو بازرگانی کەلکی لێوەربگیرێت بەلام ئەوە وا ناگەیەنێت کە بەکارهێنانی ئێستای وەك دەرمانێکی سەرشەقامو هەرەمەکیو بەتایبەتی کێشانی شتێکی رەواو پاساوهەلگرە..



5. کیتەماین Ketamine:

کیتەماین ناوە زانستییەکەی ketamine hydrocloride کە لەسەر شەقامو نێوبازارەکاندا

[99] Home Office Press Releases -CLASSIFICATION OF CANNABIS. Reference: 057/2005 - Date: 19 Mar 2005 00:01.

بەگەلێك ناوی دیکەوە ناسراوە وەك: سەوز، K، ڤیتامین K، K ی تایبەت‌و گەلێك ناوی دیکەش، دەرمانێکی هۆشبەر یان بەنجکەری بەهێزە کە بۆ مەبەستی بەنجی نەشتەرگەری لە مرۆڤو ئاژەڵدا بەکارهاتووە. ئەم مادەیە نە بەرهەمێکی گیایی نێو جەنگەڵەکانی ئەمریکای باشوورەو نە هی کوێستانەکانی ئەفغانستان، بەڵکو مادەیەکی دەستکردی مرۆڤە. کیمیاگەری بەلجیکی C.L. Stevens لە ساڵی 1963دا دۆزییەوەو لە ساڵی 1970دا بەڕێوەبەرێتی خواردن‌و دەرمانی ئەمریکی FDA بڕیاریدا کە دەکرێت کێتەماین لەزۆر باردا بۆ مەبەستی بەنج بۆ ئاژەڵ‌و مرۆڤ بەکاربهێنرێت.[108]

لەگەڵ ئەوەشدا کە کێتەماین دەرمانێکی بەنجی بەهێز بوو بەڵام هەر زوو ئاشکرا بوو کە ئاسەوارێکی لاوەکی نائاسایی هەیە.

لە سەدا بیستی ئەو نەخۆشانەی کە بەهۆی کێتەماینەوە بەنج کرابوون ڕایانگەیاند کە خەونی هۆشدار دەبینن" واتە کاتێك کە بەخەبەرن خەون دەبینن‌و دیاردەی نائاسایی مێشکیان لێوەدەردەکەوێت کاتێك لەژێر کاریگەری ئەو دەرمانەدان.لە ساڵی 1992دا لەنێو یانەو هۆڵەکانی ئاهەنگی بەریتانیادا بڵاوبووەوە، کاتێك خەڵك بەکاریاندەهێناو وایاندەزانی ئێکستاسییە Ecstasy . کێتەماین بەگەلێك شێوە هەیە، بێجگە لەشێوە شلەمەنییە دەرمانسازییەکەی، بەشێوەی دەرزی‌و لەشێوەی



[108] K., James, (1998) Ketamine: Mtaprogramming From Within the Eye of the Storm. [online]

حەبیشدا هەیە هەروەها لەشێوەی تۆزیشدا لەڕێگەی لوتەوە هەڵدەمژرێت و تانانەت هەندێك جار دەکێشرێت.[101]

کێتەماین کاریگەری ئازارشکاندنی هەیە بەڵام کاردەکاتە سەر هەستەکانیش و بەو جۆرە کاریگەرییەکی هەلوەسەهێنەرانەشی هەیە. ئەوانەی کە بەکاریدەهێنن دەڵێن وا هەستدەکەن کە لە خۆیان و خەڵکانی دیکەی دەوروپشتیان دابڕاون. ئەم دەرمانە بەگوێرەی ئەو بڕەی کە وەرگیراوە کاریگەرییەکەی دەگۆڕێت. ئەوانەی کە بڕێکی کەم وەردەگرن وا هەست دەکەن کە بوونەتە خاوەنی شەپۆلێکی بزووتن و ووزە. بەڵام ئەوانەی کە بڕێکی زۆر وەردەگرن هەست بە هەلوەسە دەکەن لەشێوەی ئەوانەی کە LSD بەکاردەهێنن و واهەست دەکەن کە لەنێو لەشی خۆیاندا نین و لێی جودابونەتەوە. دوای ئەم بارە بەشێوەیەکی گشتی هەست بە سڕبوون دەکەن، بەتایبەتی لە چوارپەلداو ماسولکەکانیان بەشێوەیەکی سەیرو نامۆ دەبزوێن. بەکارهێنەران پێدەچێت بەشێوەیەکی ترسناك بڕشێنەوەو بێهۆش بن و تەنانەت لەوانەیە بە هۆی ڕشانەوەکەی خۆیانەوە بخنکێن. ئەگەری کارەسات زۆرترە بەهۆی نەمانی کۆنترۆڵ بەسەر ئەندامەکانی لەش و بورانەوەوە. کارێکی سەختە بزانیت بڕی ئەو مادەیە چەندە کە ئەو کەسە وەریگرتوەو چیدیکەشی تێکەڵکراوە.[102]

بەشێوەیەکی گشتی ئەو زانیاریانەی کە لەسەر کاریگەرییە درێژخایەنەکانی کێتەماین لەبەردەستدان پرشوبڵاون. بەڵام هەندێك ڕاپۆرت ئەوە دەدەن بەدەستەوە کە فلاشباك و شێوانی بیروهۆش، ووریایی و بینین پێدەچێت

---

[101] Drug Scope [online]
[102] Drug Scope [online]

لەئەنجامی بەکارهێنانی بەردەوام و دووروودرێژەوە ڕوودەدەن. لەشی ئەو کەسە بەخێرایی لەگەڵیدا ڕادێت و بەردەوام پێویستی بە زیادکردنی بڕەکەی هەیە بۆ ئەوەی ئەو هەستەی پێشوی بداتێ. ئەوانەی کە بڕی زۆر بەکاردەهێنن پێدەچێت کێشیان دابەزێت و ئارەزووی خواردنیان کەمبێتەوەو لەلایەنی سایکۆلۆژییەوە خوی پێوەبگرن و تووشی کێشە دەروونییەکان ببن و پلە بەپلە پەیوەندییان بە جیهانی ڕاستی و واقعییەوە نەمێنێت.

بەکارهێنانی کێتەماین بەشێوەیەکی تایبەت ترسناکە ئەگەر لەگەڵ ئەلکهول یان دەرمانە هێورکەرەوەکانی دیکەدا بەکاربێت چونکە پێدەچێت ببێتە هۆی لەکارخستنی سییەکان یان دڵ.

درکە مۆخ کە لەنێو بڕبڕەی پشتدایە پەیام و فەرمانەکانی مێشك دەگەیەنێت بە سەرتاپای لەش و هەست و نەست بە ئازار و گلەیی و گازەندەکانیش دەگەیەنێتەوە بە مێشك. کێتەماین بەردەگرێت لەو پەیام و گلەیی هەست بە ئازار کردنانەو نامێڵێت بگەنەوە بە مێشك و هەر لەبەر ئەوەشە کە بە هۆکارێکی باشی بەنجکردن دادەنرێت.

بەڵام مەترسییەکە لەوەدایە کە بەشێوەیەکی بەردەوام بەکارهێنانی پێدەچێت ببێتە هۆی لەکارخستن یان ئیفلیجکردنی ئەو پرۆسەیە. بێگومان بەکارهێنانی بۆ مەبەستی پزیشکی و لەژێر چاودێری پزیشکی پسپۆڕدا نکولی لێناکرێت بەڵام بەکارهێنانی بۆ مەبەستی دیکەو بەشێوەیەکی بەردەوام گەلێك

مەترسی لێدەکەوێتەوە کە بێجگە لە زیانی دەرمانەکە خۆی شێوەی بەکارهێنانیشی لەڕێگای دەرزییەوە ئەگەری توشبوون بە نەخۆشی HIV ئایدز زیاد دەکات.[103]

[103] K., James, (1998) Ketamine: Mtaprogramming From Within the Eye of the Storm. [online]

لەلایەنی یاساییەوە لە UK تا ئێستا (تاکاتی نوسینی ئەم باسە) ئەم دەرمانە قەدەغە نەکراوە، بەلام ئێستاکە لەژێر باس و لێکۆڵینەوەدایەو پێدەچێت لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا بڕیاری لەسەر بدرێت. لە ئەمریکا ئەم دەرمانە قەدەغەیەو لە لیستی سێیەمی دەرمانە یاساغەکاندا پۆلێن کراوە.

## دەرمانە نوژدارییەکان:

مەبەست لە دەرمانە نوژدارییەکان ئەو دەرمانانەن کە پزیشك بەشێوەیەکی گشتی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆش بەکاریان دەهێنێت. ئەگەرچی هەندێك لەو دەرمانانەی کە بۆ مەبەستی نایاسایی بەکاردەهێنرێن خۆیان لە بنەڕەتدا بۆ مەبەستی پزیشکی دروستکراون بەلام خەڵك خراپ بەکاریاندەهێنن" ئەوانە هەریەکەیان بەپێی توانا لەشوێنی خۆیاندا باسیان کراوە. ئەوەی لێرەدا دەمەوێت باسی بکەم ئەو دەرمانانەن کە خەڵك زۆر بە ئاسانی دەتوانێت دەستی بکەوێت و زۆر بەبێ مەترسی بەکاریان دەهێنن بەبێ ئەوەی ئاگاداری مەترسییەکانیان بن. ئەو دەرمانانەی کە بەئاسانی دەست دەکەون لە وڵاتێکی وەك بەریتانیادا تەنها ئازارشکێنە سوکەکانی وەك پاراستامۆڵ و ئەسپرین و دەرمانی دژی خوران و دەرمانی کۆکەو هەڵامەت و هەندێك ڤیتامینات و بەهێزکەر دەگرێتەوە کە بەبێ ڕەچەتەی پزیشك لە دەرمانخانەو زۆر لە مارکێتەکاندا دەتوانیت بیکڕیت.

بەلام بەهیچ جۆرێك دژە تەن و دەرمانی بەهێزی دیکە ناگرێتەوەو بەبێ ڕەچەتەی دوکتۆر فرۆشتنی ئەو دەرمانانە یان بەخشینی بە کەسێکی دیکە قەدەغەیەو سزای یاسایی لەسەرە.

لە کوردستانو گەلێك وڵاتی دیکەش، بەداخەوە زۆر لە دژە تەنەکانیش دەگرنەوە کە خەڵك زۆرجاریش بە هەڵەو بەبێ ڕێنومایی پزیشکی پسپۆڕو شارەزا بەکاریان دەهێنن وەك ئەمپیسیلینو ئەمۆکسیسیلینو بەرهەمەکانی پەنسلینو هتد... دیارە لەم کاتەدا لە زۆرترین باردا زیانیان زیاترە وەك لە کەڵك.

کێشەیەکی دیکە کێشەی نەبوون یان لاوازی کۆنترۆڵی جۆرە لە وڵاتانی ناسراو بە جیهانی سێیەم یان تازە پێگەیشتوو.

کۆمپانیاکانی دەرمان ئەو هەڵە دەقۆزنەوەو گەلێك دەرمان کە لە ئەورووپاو وڵاتانی خۆرئاوادا چیدیکە بەکارنایەت ڕەوانەی دەوڵەتە هەژارەکانی دەکەن.

بە گوێرەی ڕاپۆرتی گرووپی کارا لەمەڕ تەندروستیو بوژانەوە WEMOS لە ئەمستردام، لە ساڵی 1991دا 75 بەرهەمی دەرمان کە لەنێوانیاندا دژەتەنیش هەبوەو لەیەکێك یان زیاتر لە دەوڵەتە ئەورووپییەکاندا یا قەدەغەکراون یاخود لەبەکارهێنان کشێنراونەوە لە جیهانی سێیەمدا بینراونو دەستنیشانکراون.[104]

هەبوونی ژمارەیەکی یەکجار زۆری دەرمان بە گەلێك ناوی بازرگانی جیاوازەوە لەو وڵاتانەدا ئەگەری فراوانی بواری ئەو بازرگانییە دزێوە زیاتر دەکات" Ong Beng Gaik دەڵێت:

"کاتێك شێوازێکی سەرکەوتووی دەرمانێك دەکەوێتە بازاڕەوە، کۆمپانیاکانی دیکەش بەپەلەپڕوزێ دەکەونە خۆ بۆ بەدەستهێنانی

[104] Misuse and overuse of antibiotics: who is to blame? TWN Third World Network [online]

سەرمایەو بە بەرهەمهێنانی دەرمانی دیکەی هاوشێوەی ئەوێ تر بۆ ئەوەی پشکێکیان دەستبکەوێت لەو بازاڕە گەرمەدا. هەر لەبەر ئەوەیە کە تەنها لە هیندستان بازاڕی دەرمان 70000 بەرهەمی تێدایە بەبەرانبەر کردن لەگەڵ لیستی دەرمانە بنچینەییەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانیی WHO کە تەنها 250 دەرمانی لەخۆگرتووە."[105]

هەروەها نوسەر لەمەڕ دژەتەنەکانیش دەڵێت:

"لە لیستی دەرمانە بنچینەییەکانی WHOدا تەنها 20 دژەتەن دیاریکراوە، بەڵام بۆ نمونە لە مالیزیا 200 بەرهەمی دژەتەن دەفرۆشرێت."[106]

لەبەر ئەوەی من نە پزیشکم و نە پسپۆڕی بواری دەرمانسازیم و بواری ئەم کتێبەش ئەوەندە فراوان نییە کە هەموو دەرمانێک بگرێتە خۆ، لەبەرئەوە تەنها ئەوەندە دەتوانم بڵێم کە بەکارهێنانی دەرمان و بەتایبەتی دژەتەنەکان بەبێ ڕێنومایی پزیشک ترسناکەو پێویستە سنوردار بکرێت. لێرەدا من وەک نمونە باسی زیانی خراپ بەکارهێنانی ئەو دەرمانانە دەکەم کە لە بەریتانیا بەبێ ڕەچەتەی پزیشک دەتوانرێت بکڕێن و بەکاربهێنرێن.

زیانی ئەو دەرمانانە دەگەڕێتەوە بۆ خراپ بەکارهێنانیان و پەیوەندی هەیە بە جۆری دەرمانەکەو بڕی بەکارهێنانی یان بەکارهێنانی لەگەڵ دەرمانی دیکەدا. ئامارەکان لە UK واڕادەگەیەنن کە 50000 کەس دەستنیشانکراون کە تووشی باری دژوار یان تەنانەت کوژەریش بوون بەهۆی خراپ بەکارهێنانی ئەو

[105] Ibid
[106] Ibid

دەرمانانەوە. لانی کەم 2000 کەس لە ساڵێکدا بەهۆی ئاسەوارەکانی ئەسپرین‌و دەرمانەکانی دژی هەوکردنەوە دەمرن. پێویستە ئەوەش بوترێت کە ئەو دەرمانانە هەموویان سەلامەتن ئەگەر بەڕێکوپێکی‌و شارەزایی بەکاربهێنرێن‌و مەترسییەکان لە خراپ بەکارهێنانیاندایە.[107]

ئەو دەرمان‌و مادە هۆشبەرانەی کە هەتا ئێرە باسکراون بەشێوەیەکی گشتی دەرمانە هەرە باوو بڵاوو مەترسیدارەکانی گرتۆتەوە کە لەلایەن ئاژانسەکانی کۆنترۆڵکردنی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکانی بەریتانیاو ئەورووپاو ئەمریکاو نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەستنیشانکراون. بیارە ژمارەی گشتی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان زۆر لەوە زیاترەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش گۆڕانکاری ڕوودەدات لەو بوارانەداو پسپۆڕان‌و زانایان لەسەرتاسەری جیهاندا ڕۆژانە ئەزمونی نوێ ئەنجامدەدەن لەسەر زیان‌و مەترسی هەردەرمانەو پشت دەبەستن بە تاقیکردنەوەو سەلماندنی زانستی.

---

[107] **Home Office UK, (2004) Substance Misuse and the Workplace. A training pack. P.2.19**

# چـونێتی بەرەنگاربوونـەوەی دەرمـانو مادە هۆشبەرەکان؟

کۆنترۆلکردن ـ پەروەردەکردن ـ چارەسەرکردن

مرۆڤو وێڵبوون بەدوای بەختەوەریدا

لەڕاستیدا سەرکەوتوترین بەرنامە ئەو بەرنامەیەیە کە خەڵك بڵێن: من ئەو کارە ناکەم چونکە خراپە، چونکە عەیبەو ئابڕوم دەچێت، چونکە لەکۆمەڵگاو هاوڕێیانم دادەبڕێم و تەریك دەکەوم نەك تەنها لەبەرئەوەی قەدەغەیە یان حەرامە.

# کۆنترۆڵکردن ـ پەروەردەکردن ـ چارەسەرکردن

بەرەنگاربوونەوەی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان ئەرکێکی ئاسان نییە بەڵکو بەسەختترین ئەرکی دەوڵەتان، چ گەورەو چ بچوک، و نەتەوە یەکگرتووەکانیش دادەنرێت. لە جیهاندا بە هەزاران دەزگای دەوڵەتان و نێو دەوڵەتی دامەزراوە بۆ مەبەستی بەرەنگاربوونەوە بەو مادانەو ساڵانە بودجەی گەورەو گرانی بۆ تەرخاندەکرێت.

پێدەچێت کەسێك بڵێت جا ئەگەر ئەو دەوڵەتە گەورانەو نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانسە هەواڵگرییە نێودەوڵەتییەکان نەتوانن بەرەنگاریان ببنەوە، ئێمەی هەژار دەتوانین چیبکەین! یاخود کەسێکی دیکە بڵێت ئەوانەی گیرۆدەی ئەو مادانە بوون خۆیان خەڵکی خراپ و گومڕان و ئەوە کێشەی من نییەو پەیوەندی بە منەوە نییە نە من و نە ماڵ و منداڵی من توشی ئەو کێشانە نابن!

لەڕاستیدا کێشەی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان کێشەی هەموانە بە تاك و کۆمەڵ و بە ڕۆشنبیرو خەڵکی ڕەمەکییەوەو بەرەنگاربوونەوەی دەرمان و مادە هۆشبەرەکانیش ئەرکی هەموانە چ تاك و چ کۆمەڵ چ دەوڵەت و چ خەڵکی سیڤیل.

لە ئەمڕۆی سەردەمی جیهانگیری و هەراج بوونی هۆکارەکانی پەیوەندی و ڕاگەیاندن و گواستنەوەو هاتوچۆدا هەموو دیاردەیەك چ باش و چ خراپ دەگاتە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانەو خۆی دەکات بە هەموو ماڵێکدا. دەوڵەمەند بیت یان هەژار ڕۆشنبیر بیت یان نەخوێندەوار لە ئەوروپاو ئەمریکا بژیت یان لە گوندێکی بچوکی ناوچەیەکی دوورەدەستی وڵاتێکی

هەژار، تەکنۆلۆژیای نوێ کاریگەرییەکانی لەسەرت جێدەهێڵێت و ناهێڵێت تەنیار دوورەدەست بمێنیتەوە: خۆی دەکات بەنێو ماڵ و خێزانتداو کاریگەری خۆی لەسەر لە منداڵ و گەنجەکان جێدەهێڵێت" ئەمەش جارێکی دیکە لایەنی خراپ و باشی هەیەو پێویستی بە خۆئامادەکردن و جەنگینە بەرانبەر دیاردە خراپەکان. ئەمڕۆ لە ڕێگای سەتەلایت و ئینتەرنێتەوە هەواڵی هەموو جیهان چرکە بە چرکە دەبیستین، سەدان ماڵپەڕی ئینتەرنێت تەرخانکراوە بۆ پەروەردەو ڕێنومایی دژی دیاردەخراپەکان بە دەرمان و مادە هۆشبەرەکانیشەوە، بەڵام نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە بە سەدانی دیکەش پڕوپاگەندە بۆ ئەو دیاردە دزێوانە دەکەن چ بەشێوەی ڕاستەوخۆو چ ناڕاستەوخۆ.

بەرەنگاربوونەوەی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان ئەرکی هەموانە چونکە ئێمە ناتوانین بەیەك تاکە ڕێگا بەرەنگاریان ببینەوە. ئەگەر ئەو ئەرکە تەنها بە ئەرکی پۆلیس و ئاسایش بزانین ئەوا پێدەچێت کەوتبینە هەڵەیەکی گەورەوە" چونکە لایەنەکانی دیکەمان فەرامۆشکردووە.بەشێوەیەکی گشتی بەرەنگاربوونەوەی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان دەکرێت بەم شێوەیەی خوارەوە ڕێکبخرێت:



سێکوچکەی کۆنترۆل، پەروەردە، چارەسەر ئەو سێ پایەیە کە بەرنامەیەکی سەرکەوتوو گشتگیر دەتوانێت لەسەری ڕابوەستێت و بەڕێبازی گونجاودا پێشڕەوی بکات.

کۆنترۆل هەر بەناوەکەیدا دیارە کە بریتییە لە کۆنترۆلکردنی سنوورو بازاڕو شوێنە گشتییەکان لە دیاردەی قاچاخچێتی و دزەکردن و هەبوون و خستنەڕووی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان. ئەو مەسەلەیەش بە پلەی یەکەم ئەرکی پۆلیس و ئاسایش و دەزگا هەواڵگرییەکانە، بەڵام هاوکاری هاوڵاتیانیش لەم نێوەندەدا گرنگییەکی ژیانیی هەیەو دەتوانن زانیاری گرنگ پێشکەش بەو دەزگایانە بکەن لەپێناوی سەرخستنی ئەرکەکانیاندا. بەشێوەیەکی بنەڕەتی کۆنترۆل دژی بازرگانی پێوەکردن و دابینکردنی ئەو مادانەیەو دیارە تا کۆنترۆڵیش بەهێزتر بێت هەبوونی دیاردەکە کەمتر دەبێتەوە.

دەوڵەتە جیاوازەکان ستراتیژییەتی جیاجیایان هەیە بۆ کۆنترۆلکردنی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان. بەشێوەیەکی گشتی زۆربەی دەوڵەتان و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە دیاردەی قاچاخچێتی کردن بەو مادانەوە تاوانێکی گەورەی نێودەوڵەتییەو پێویستە هاوکاری و هاوئاهەنگی جیهانی لەسەربکرێت. شایانی باسە نە لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی و نە لەسەر ئاستی دەوڵەتە تاکەکان بە هێزە هەرە گەورەکانیشەوە لە هیچ شوێنێکی ئەم جیهانە کۆنترۆڵی تەواو نەکراوە بەسەر قاچاخچێتی دەرمان و مادە هۆشبەرەکاندا. بێگومان ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ گەلێک هۆ لەوانە قاچاخچێتی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان بەشێکی دانەبڕاوە لە تۆڕی تاوانە ڕێکخراوەکان کە قاچاخچێتی ئەو مادانەو چەکو تیرۆریزمی

نێودەوڵەتیش دەگرێتەوە. بەڕێوەبەرێتی داسەپاندنی یاسای دەرمان و مادە هۆشبەرەکانی ئەمریکا DEA جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پەیوەندییەکی نەپساوە هەیە لەنێوان تیرۆریزمی جیهانی و قاچاخچێتی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان و بزوتنی پارە لەنێوان دەوڵەتاندا (حەواڵە).[1] ئەوان لەوباوەڕەدان کە گروپ و باندە قاچاخچییەکان لە ڕێگای حەواڵەو گواستنەوەی نایاسایی پارەی کاش و حساب بانکی ساختەو کڕینی زێڕەوە دەتوانن پارەی فرۆشتنی دەرمانەکانیان کۆبکەنەوە. لە ئەفغانستان بزوتنەوەی تالیبان بە بڕوای DEA زۆربەی پارەو پولی خۆی لە ڕێگای قاچاخچێتی دەرمانەوە پێکەوەناوە. هەرچەندە بە گوێرەی ڕێکەوتننامەیەک لەگەڵ بەرنامەی کۆنترۆلکردنی دەرمان و مادە هۆشبەرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا (UNDCP)تالیبان هەستا بە تێکوپێکدانی کێڵگەکانی ئەفیون لەبەرانبەر وەرگرتنی یارمەتیدا لە نەتەوە یەکگرتووەکان. بەڵام دوای جەنگی ئەمریکا لەو وڵاتە ئەو بارە شێواو ڕادەی چاندنی ئەو مادەیە بەشێوەیەکی سامناک چووەسەرەوە، کە بەگوێرەی ڕاپۆرتی UNDCP بەڕادەی 1400٪ بووە.[2] بەڵام دوای ئاسایی بوونەوەی بارودۆخی شەڕ ئەو ڕادەیە دابەزیوەتەوە بۆ ئاستێکی باشتر. لە کۆلۆمبیاش گروپە سیاسییەکان بەپارەی کۆکاین درێژە بەو شەڕە ناوخۆییە نەپساوەییەیان دەدەن و قاچاخچییە هەرەگەورەکانی دەرمان لە مەیامی بوونەتە خاوەنی کۆشک و

[1] US Drug Enforcement Administration DEA. Narco-Terrorism. [online]
[2] Claire, A.,& Smith, H., (2003) Drug Culture: The Facts Behind the Headlines. London: Franklin Watts p.14

ڤیللای ئەفسانەیی.[3] چەندەها جار هەوڵدراوە کێڵگەکانی دەرمان خاپور بکرێن، دەرمانو مادە هۆشبەرەکان بسوتێنرێنو قاچاخچیان لەداربدرێن، بەڵام تا ئەوکاتەی خواست لەسەر ئەو مادانە زۆر بێت قاچاخچێتی بەو مادانەوە هەر بەردەوام دەبێتو گەر دەرگاو پەنجەرە دابخەن لە سەربانەوە هەڵدەکێشرێت!

گرانی نرخی مادەکان وایکردووە کە خەڵکانێکی زۆری تێوەبگلێن بە تەماعی بەدەستهێنانی پارەیەکی زۆر لەماوەیەکی کەمدا. ئەمڕۆ ئەو باندو تاقمە تاوانکارییانە کەڵك لە پێشکەوتوترین بەرهەمی تەکنۆلۆژیای مۆدێرن وەردەگرنو بە پاڵپشتی ئەو پارەیەی کە لەو بازرگانییە درێوەدا دەستیان دەکەوێت تۆڕەکانی خۆیان بەسەرتاسەری جیهانەوە گرێداوە. باندەکانی قاچاخچی دەرمانو مادە هۆشبەرەکان لە هیندستانو پاکستانو ئەفغانستانو ئێرانەوە بەرەو ئەرمەنستانو ئازەربایجانو تورکیا دەکشێنو دەگەنە ئەوروپا. لەلایەکی دیکەشەوە لە وڵاتەکانی ئەمریکای لاتینەوە، بەتایبەتی کۆلۆمبیا، بەرەو ئەمریکاو ئەوروپا جارێکی دیکە پێکەوە گرێ دەدرێنەوە. بێگومان گەندەڵی سیاسیو ئابوری لەو وڵاتانەداو هێزی بەرتیلو پارە بووەتە هۆی ئەوەی کە بتوانن بە ئاسانی هاوکارو خۆفرۆش لەنێو هێزەکانی ئاسایشو پۆلیسو تەنانەت گەورە پیاوانی سیاسیشدا بدۆزنەوە. ئاژانسی دەرمانی یەکێتی ئەوروپا نیگەرانی خۆی دەربڕیوە لە فراوانبوونی ئەوروپاو هاتنی 10 ئەندامی نوێ بۆ نێو کۆمەڵەی ئەوروپا لە 2004دا. راپۆرتەکە پێشنیاری ڕێوشوێنی نوێ دەکات بۆ بەگژاچونەوەی باندەکانی

---

[3] Ibid P. 15

قاچاخچی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان کە لەگەڵ هەلومەرجی نوێی ئەوروپادا بگونجێت.[4] لەڕاستیدا گەندەڵی لەهەموو شوێنێکی جیهاندا بە پلەی لێك جیاواز هەیەو وەك Bean دەڵێت هەندێك جار لە وڵاتێکی وەك بەریتانیاشدا هەندێك کارمەندی پۆلیس‌و گومرگ تووشی گەندەڵی دەبن‌و لەبەرژەوەندی قاچاخچیان کاردەکەن.[5] بەڵام ئەم دیاردەیە زۆر کەم‌و دەگمەن‌و زۆر سنوردارەو زوو پەردەی لەسەر هەڵدەماڵدرێت لەو وڵاتانەدا. لە وڵاتە خۆرئاواییەکاندا بێجگە لەوەی کە باندەکانی قاچاخچی چالاکن‌و بریکارو نوێنەری ناوچەییان هەیەو دوکانەکانیان لەگەڕدان، تاقیگەو کۆمپانیای نهێنیش هەیە بۆ دروستکردن یان گەشەپێدانی چەندەها جۆر دەرمان. نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە ڕژێمی سەرمایەداری لەسەر بناغەی بازاڕی ئازادو قازانجی زیاتر دامەزراوەو خودی ئەو ڕژێمە زەمینەیەکی لەبارە بۆ گەشەکردنی ئەو تاوانانەو گەلێك تاوان‌و کێشەی کۆمەڵایەتی دیکەش.

بێگومان قەوارەو هێزی ئەو بازرگانییە درێژوە مانای ئەوە نییە کە دەستەوسان بوەستین‌و بڵێین کار لەکار ترازاوە. ئەوەی بەشێوەیەکی پراکتیکی دەکرێت بهێنرێتە دی کەمکردنەوەی ئاستی ئەو بازاڕەیە هەتا ئەو شوێنەی کە دەکرێت‌و بەرگرتنە لەوبازرگانییە درێژوە لەهەر شوێنێك کە دەست پێی ڕابگات. ئەم ئەرکەش ئەرکی تاکەکەس‌و دەوڵەت‌و حکومەتە بچوك‌و گەورەو ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکانە هەموویان پێکەوە.

---

[4] European Monitoring Centre for Drugs and Drug Addiction. 2003 Annual Report-Lisbon.
[5] Bean, P., (2004) Drugs and Crime. 2nd ed. Devon: Willan Publishing. P.44

کێشەی دووەم کە پێویستی بە کۆنترۆلکردنە کێشەی ئالودەگییە بە دەرمانو مادە هۆشبەرەکانەوە. ئەوانەی کە بەتەواوەتی ئالودەبوون بەردەوام پێویستییان بەبڕی زیاتری ئەو مادانەیە، بەتایبەتی مادە هەرە بەهێزەکان. شتێکی بەڵگە نەویستیشە کە ئەو مادانە گران بەهان " ئەوەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە بەشێوەیەکی بەردەوام پێویستییان بەبڕێکی زۆر پارە هەیە. ئەوانەی کە ئالودەبوون توانای کارکردنیان یان نییە یان لاوازەو ئەگەری دەستکەوتنی کاریشیان زۆر کەمە بەهۆی وریابوونەوەی زۆربەی خاوەن کارەکان لە کێشەکانیانو سەرباری هەموو ئەوانەش چ پارەیەك دەرەقەتی ئەوە دێت کە کەسێك ڕۆژانە پێویستی بە 160 پاوەندی ئیستەرلینی بێت بۆ ئەوەی خووەکەی پێ کپبکاتەوە ! [6]

لێرەدایە کە زۆربەی ئالودەبوان دەست دەدەنە تاوانو ئەمەش سەرەتایکێشەیەکی دیکەیە. لێرەدلیە کە کۆنترۆلکردن پێویستە بۆ بەرگرتن لەتاوانەکانیانو پاراستنی کۆمەڵگە لێیان.

زیادبوونی ژمارەی زیندانییەکانو سەرپێچیکردنی بەردەوامی ژمارەیەکی هەرچی زیاتری گەنجانو گەڕانەوەی زۆر لە ئازادکراوەکانە بۆ تاوانی گەورەترو ئاڵۆزتر هەڵوەستەی بە لایەنگرانی بیرۆکەی کۆنترۆلکردو ناچاری کردن بە ڕێوشوێنەکانیاندا بچنەوە. ڕۆڵی کۆنترۆڵ بۆ پاراستنی کۆمەڵگە لە تاوانبارانو باندەکانی قاچاخچیو هاوکارەکانیان ناکرێت فەرامۆشبکرێت ، بەڵام چارەسەرکردنی ئاو لەسەرچاوەوە ئامانجی سەرەکییە نەك لە گۆماودا. هەر بەتەنها لە بەریتانیادا لە ماوەی نێوان نیسانی 2002و کانونی یەکەمی

[6] Home Office. Drug Strategy Progress Report 2004. Tackling Drugs. Changing Lives: keeping Communities Safe from Drugs. P. 6

2003دا 26079 کیلۆ کۆکاین و 11044 کیلۆ هیرۆین دەستگیرکراوەو زیاتر لە 330 باندی قاچاخچی و تاوان هەلوەشێنراونەتەوە.[7]

پەیوەندییەکی نەپساوە هەیە لەنێوان دەرمان و مادە هۆشبەرەکان و تاواندا. قاچاخیی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان خۆی لەخۆیدا مانای ئەوەیە هەرکەس بەکاریان بهێنێت یان لەلای خۆی گلیانبداتەوە تاوانێکی ئەنجامداوە. لەلایەکی دیکەشەوە گرانی ئەو مادانە کارێکی ئەوتۆیان کردووە کە زۆربەی ئالودەبوان بۆ بەدەستهێنانی پارەکەیان پەنا دەبەنە بەر تاوان.

بەمجۆرە لەنێو بازنەیەکی بۆشدا دەخولێنەوە:




---

[7] **Home Office. Drug Strategy Progress Report 2004. Tackling Drugs. Changing Lives: keeping Communities Safe from Drugs. P. 3**

لێرەدا بۆ سەلماندنی هۆی گرانی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان چەند داتایەك دەخەینە ڕوو:

کیلۆیەك ئەفیون لە ئەفغانستان بۆ جوتیارەکان دەوروبەری 35 دۆلاری ئەمریکی ( $ ) دەگرێتەوە بەلام کاتێك دەگاتە بەریتانیا کیلۆی 25000 $ دەگرێتەوە. کۆکاینیش بەهەمان شێوە لە کۆلۆمبیا کیلۆی 300 $ ە بەلام کاتێك دەگاتە سەر سنوری ئەمریکا کیلۆی 3000 $ دۆلار دەکات. کاتێك دێتە ناو ئەمریکاوە کیلۆی دەگاتە 12000 $و کە دابەشدەکرێت بەسەر بەکارهێنەراندا کیلۆی 20000 $ دەگرێتەوە.[8]

هەندێك بیروڕایان وایە کە ئەگەر دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان ئازادبن تاوان کەمدەبێتەوە، بەلام هیچ بەلگەیەك بەدەستەوە نییە کە بیسەلمێنێت ئازادکردنی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان دەرئەنجامێکی باشی لێدەکەوێتەوە. (Bean)جەخت لەسەر ئەو مەسەلە دەکاتەوەو دەڵێت کە یاسایی کردنی دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان تەنها کارئاسانییە بۆ قاچاخچییەکان‌و هیچ ئەنجامێکی باشی نابێت ئەو باسی ئەوە دەکات کە ئەگەر قاچاخچییەکان بزانن ئەو مادانە قازانجیان کەمترە ئەوا پەنا دەبەنە بەر مادەی دیکە وەك قاچاخچێتیکردن بە جگەرەوە.[9] بوارێکی دیکەی پەیوەندی نێوان دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان‌و تاوان مەسەلەی نەخۆشی HIV Aids ە. ئەوانەی کە ئالودەبوون بەو مادانەوە زۆریان لەڕێگای

[8] Bean, P., (2004) Drugs and Crime. 2nd ed. Devon: Willan Publishing. P. 146
[9] Ibid P. 245

دەرزییەوە بەکاریاندەهێنن. ئاشکراشە کە بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشیانە لەڕێگایبەریەککەوتنی خوێنی کەسێکی نەخۆش و کەسێکی ساخەوە ڕوودەدات. مەسەلەیەکی دیکەش کە زیاتر قورەکە خەست دەکاتەوە ئەوەیە کە ئەو ژنانەی ئالودەبوون زۆربەیان خەریکی دیاردەی لەشفرۆشیین بۆ دابینکردنی پارەکەیان" یان ڕوونتر بڵێین زۆربەی هەرەزۆری لەشفرۆشەکان ئالودەن بەم مادانەوە:

90٪ی لەشفرۆشانی سەرشەقامەکان دەرمانی پۆلی A بەکاردەهێنن بێجگە لەوەش دیاردەی لەشفرۆشی پەیوەندییەکی نەپساوەی هەیە بە قاچاخچێتی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان و تاوانی ڕێکخراوەوە.[10]

دیاردەی لەشفرۆشی لەبارترین مەیدانە بۆ تەشەنەکردنی نەخۆشییە زایەندییەکان (سێکسییەکان) و بەمجۆرە دەرمان و مادە هۆشبەرەکان ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینن لە پەرەپێدانیدا.

دەرمان و مادە هۆشبەرەکان ساڵانە دەبنە هۆی مردن یان گرفتاربوونی خەڵکانێکی زۆر. ئەو کارەساتانەش گەلێك هۆی لێکجیاوازیان هەیە کە هەر لە تێکەڵکردنی چەند مادەیەك و مادەی دیکەی نامۆوە لەگەڵ دەرمانەکاندا بیگرە تا ژاراوییبوون و زیادەڕەوی لە بەکارهێناندا و نەشارەزایی لە هێز و بڕی مادەکە و نەخۆشییە دەروونییەکان و خۆکوشتن و پەلامارو دەستدرێژی جەستەیی و سێکسی و ئیغتیساب Rape و دەیان و سەدان کێشەی دیکە دەگرنەوە.[11] هەروەها دەڵێت:

---

[10] Home Office. Drug Strategy Progress Report 2004. Tackling Drugs. Changing Lives: keeping Communities Safe from Drugs. P. 18

"پیاوێك كە بەهۆی ئالودەبوون بە دەرمانی وەك هیرۆین و كۆكاین كۆنترۆڵی خۆی لەدەستداوە زۆر نزیكە كە بڕی لە 80 بۆ 100 تاوانی دزی ئەنجامبدات لە ساڵێكدا. یاخود ژنێكی لەو جۆرە پێدەچێت پەنا بباتە بەر دیاردەی لەشفرۆشی بۆ ئەوەی دەرمانەكەی پێبكرێت."□□

لەڕاستیدا هەروەك Bean جەختی لەسەر كردۆتەوە ئەو ژنانەی كە دەرمان و مادە هۆشبەرەكان بەكاردەهێنن هەمان كێشەكانی پیاوانی بەكارهێنەریان هەیە. بەهەمان شێوە گیرۆدەی دەردو كێشە تەندروستییەكان دەبن و بەهەمان شێوەش لەكاتی زیادەڕەویدا لە بەكارهێناندا دەمرن. ئەوانیش وەك پیاوان كێشیان بەشێوەیەكی بەرچاو دادەبەزێت و گرفتاری نەخۆشییەكانی وەك زەردووی جۆری B و C دەبن. ژنانیش وەك پیاوان تووشی لەدەستدانی ووزەی ماسولكەكان و كەم خۆراكی و هەموو كێشە تەندروستییەكانی دیكە دەبنەوە. بەڵام ئەوەی كە ژنان هەڵدەهاوێرێت و تایبەتمەندی نوژداری تایبەتیان پێدەبەخشێت ئەو كێشانەیە كە پەیوەندی هەیە بە سكپڕی و منداڵبوونەوە و كاریگەرییەكانی دەرمانە لەسەر كۆرپەلەی لەدایك نەبوو یان تازە لەدایكبوو.

ئەوەی كە زیاتر جێگەی سەرنجە ئەو كێشە كۆمەڵایەتی و سایكۆلۆژیانەیە كە چواردەوری كەسێك دەدەن كە دایكە و ئالودەشە بە دەرمان و مادە هۆشبەرەكانەوە و ئەو تەنگەشەیە چ ئاسەوارێك لەسەر منداڵەكانی جێدەهێڵێت! .□□

---

[11] Bean, P., (2004) Drugs and Crime. 2nd ed. Devon: Willan Publishing. P.14

[12] Ibid P.28

[13] Ibid P. 210

سەربارى ئەو كێشانەش كە باسكران هەر لەدياردەى لەشفرۆشىو نەخۆشییە زایەندیەکانەوە بیگرە تا دەگاتە سکپڕیو منداڵبوونو دایکایەتی، ژنانی ئالودە زۆربەی جار دووچاری دەستدرێژی سێکسی دەبنەوەو ئەوەش کاریگەری دەرونی قووڵ لەسەریان جێدەهێڵێت" لەکاتی هەر پرۆسەیەکی چارەسەردا پێویستە ئەو لایەنەش بایەخی پێبدرێتو بەهەند وەربگیرێت.[14]

Bean پەیوەندی نێوان تاوانو دەرمانی لەسێ خاڵدا ڕوونکردۆتەوە.[15] ئەو پەیوەندییە دەکرێت لەو شێوەیەی خوارەوەدا بەرجەستە بکرێت:

- **بەکارهێنانی دەرمان دەبێتە هۆی تاوان**
- **تاوان دەبێتە هۆی بەکارهێنانی دەرمانو مادە هۆشبەرەکان**
- **دەرمانو تاوان دوو ڕووی لەیەک دراون**

---

[14] Ibid P. 224
[15] Ibid P.31

بەکارهێنانی دەرمان
دەبێتە هۆی تاوان



دەرمان‌و تاوان
دوو رووی یەک
دراون

تاوان دەبێتە
هۆی دەرمان

بەهەمان شێوە Bean باسی پەیوەندییەکی دوولایەنە دەکات لەنێوان پەشێوییە دەروونییەکان و خراپ بەکارهێنانی مادە کیمیاوییەکاندا
خراپبەکارهێنانی مادە کیمیاوییەکان ⟵ پەشێوییە دەروونییەکان.[16]

ئەزمونەکان دەریانخستووە کە بنبڕکردنی دەرمان و مادە هۆشبەرەکان بەشێوەیەکی بنچینەیی و هەتا هەتایی شتێکی ئەستەمە.

هەروەها بەرگرتن لە چاندنی ئەو مادانەش لە وڵاتە بەرهەمهێنەکاندا ئەگەرچی زۆر باشە بەڵام ئەویش دیسان لەئەستەمەوە نزیکە. بەرگرتن لە گەیشتنی ئەو مادانەش بە بازاڕی وڵاتانی جیهانیش هەر ئەستەمە. بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە دەرمان و مادە هۆشبەرەکان هەمیشە پێویستیان بە کڕیارو ئالودەیەو ئەگەر ئەو کڕیارو ئالودانە نەبن یان کەمبن ئەوا ئەوانیش بازاڕیان کز دەبێت.[17] هەر بەپێی ئەو بۆچونە کەمکرنەوەی خواست لەسەر ئەو مادانە پەکخستنی خستنەڕووەو پێویستە جەختی زیاتر لەسەر لایەنی خواست بکرێت، کە دیارە ئەویش دەمانبات بەرەو خاڵی دووەم و سێیەم کە پەروەردەو چارەسەرکردنن.

بەمجۆرە ڕوندەبێتەوە کە کۆنترۆڵکردن بەشێوەیەکی ڕەهاو سەداسەد نایەتە دی و هەر لەبەرئەوەشە کە بەتەنها ناتوانرێت پشتی پێببەسترێت، یاخود بە تاکە لێپرسراو بزانرێت بۆ ئەم دیاردەیە.

کۆنترۆڵکردن پێویستە هاوتاو هاوشان بێت لەگەڵ بەرنامەیەکی پەروەردەیی هاوچەرخ و گشتگیر. پەروەردەیەک کە بتوانێت منداڵان و گەنجان بەشێوەیەک پەروەردەبکات کە دیاردەی بەکارهێنانی دەرمان و مادە

[16] Ibid P. 51
[17] Ibid P. 236

هۆشبەرەکان بە شتێکی دزێوو نەفرەتلێکراو بزانن‌و نەیانەوێت لەو کێشانەوە بگلێن. لەڕاستیدا سەرکەوتوترین بەرنامە ئەو بەرنامەیەیە کە خەڵك بڵێن: من ئەو کارە ناکەم چونکە خراپە، چونکە عەیبەو ئابڕووم دەچێت، چونکە لەکۆمەڵگاو هاوڕێیانم دادەبڕێم‌و تەریك دەکەوم" نەك تەنها لەبەرئەوەی قەدەغەیە یان حەرامە.

بەردی بناغەی هەر پەروەردەیەکی پتەو لە خێزانەوە دەستپێدەکات. خێزانەکان ئەرکێکی بنچینەییان هەیە لە پەروەردەی منداڵەکانیاندا. ئەزمونەکانی ژیان سەلماندوویانە کە ئەو منداڵانەی لە خێزاندا پەروەردەیەکی باش‌و گونجاویان دەبێت لە قوتابخانەش باشتر کەڵك لە پەروەدەی خوێندن‌و ڕەسمی وەردەگرن‌و ئەگەر لە قۆناغی گەنجی‌و هەرزەکاریشدا هەندێکیان سەرکێشی‌و لاساریان پێوەدیاربێت‌و پێچەوانەی ویستی دایك‌و باوك‌و مامۆستا بوەستنەوە، لە قۆناغێکی دواتردا دەگەڕێنەوە سەر بنچینەی پەروەردی منداڵییان. کۆمەڵگا خۆرئاواییەکانیش ئێستا زۆر جەخت لەسەر پەروەردەی نێو خێزان دەکەنەوەو تەنانەت ئەو منداڵانەش کە پەروەردەیەکی خێزانی گونجاویان نییە ئەرکی سەرشانی دەوڵەتە بەخێویان بکات. ئەگەرچی دەوڵەت ئەو منداڵانە بەشێوەیەکی باش‌و گونجاو پەروەردە دەکات بەڵام بەهیچ کلۆجێك ناتوانین بڵێین ئەوە بە تەواوی جێگای پەروەردی نێو خێزان دەگرێتەوە. وەزارەتی ناوخۆی بەریتانی چەند گروپێك منداڵی دەستنیشانکردووە کە زیاتر پێویستیان بە چاودێری هەیەو ئەگەری ئالودەبوونیان زۆرە:

- ئەو منداڵانەی کە دایك‌و باوکیان دەرمان‌و مادە هۆشبەرەکان بەکاردەهێنن.
- ئەوانەی کە لە قوتابخانە وەدەرهاتوون یان ڕێژەی بزربوونیان بەرزە.
- ئەو منداڵ‌و گەنجانەی کە لەلایەن دەزگا کۆمەڵایەتییەکانەوە پەروەردە دەکرێن.

## سەرپێچیکەرە گەنجەکان young Offenders [18]

بەم شێوەیە ڕووندەبێتەوە کە لەهەر کۆمەڵگایەکدا بژێت پەروەردەی خێزانیو هەبوونی کۆششی خێزانێکی گەرم بنچینەیەکی پتەوە بۆ پەروەردەیەکی ڕێکوپێکی منداڵ، جا نەبوون یان لاوازبوونی ئەو جۆرە باوەشە گەرمە لە کۆمەڵگایەکی خۆرئاوایدا بە خاڵێکی پۆزەتیف دانانرێت بەڵکو خاڵێکی نێگەتیفەو خۆیشیان ئەو ڕاستییە باش هەڵدەسەنگێنن.

دوای پەروەردەی نێو خێزان پەروەردەی قوتابخانە دەستپێدەکات. پێویستە بەرلەوەی بەرنامەیەك بۆ منداڵان دابڕێژین بەرنامەیەکی پەروەردەیی ڕاستو دروست دەربارەی دەرمانو مادە هۆشبەرەکان بگاتە هەموو مامۆستایانو مامۆستایان بەوپەڕی متمانەو باوەڕەوە ئەو مەسەلەیە لەگەڵ خوێندکارەکانیان باس بکەن. ئەگەر مامۆستایەك زانیاری پێویستی نەبێت دەربارەی دەرمانو مادە هۆشبەرەکان چۆن دتوانین داوای ئەوەی لێبکەین کە منداڵان لەمەترسییەکانی ئەو مادانە هۆشیاربکاتەوە؟ ئەو کارەش دیارە کارێکی بەپەلە نییەو پێویستی بە ئەرکو ماندووبوونێکی زۆر هەیەو کاتو پارەو کارمەندی پێویستە. دوای قوتابخانەو خوێندنگاو پەیمانگاو زانکۆکان ئەرکی پەروەردەیی دەکەوێتە سەر ئەنجومەنی گەڕەکەکانو ڕێکخراوە دیموکراتیو پیشەییەکانو سەنتەرەکانی چالاکی گەنجانو بنکەکانی دیکەی پەروەردیی وەك بنکەی منداڵانی ئیشکەرو هتد.

---

[18] Home Office. Drug Strategy Progress Report 2004. Tackling Drugs. Changing Lives: keeping Communities Safe from Drugs. P. 11

هەبوونی سەنتەرەکانی چالاکی گەنجان هەنگاوێکی بەرچاو بوو. ئەو هەنگاوە شایستەی ڕێزو هاندانو گەشەپێدانەو شتێکی باشتریشە ئەگەر ئەو سەنتەرو بنکانە لەهەموو شوێنێکی کوردستان بکرێنەوەو گوێنەدرێت بە لایەنی سیاسیو پەیوەندی پارتایەتی. ئەو سەنتەرانە، ئەوەندەی من ئاگادارم ڕۆڵی بەرچاویان بینیوە لە هوشیارکردنەوەی گەنجانداو دەکرێت وەك بنکەی پەروەردەی گەنجان بۆ تێوەنەگلان لە دەرمانو مادە هۆشبەرەکان بەکاربهێنرێنو لەهەمانکاتیشدا بۆ ڕاهێنانەوەی گەنجانی لادەرو سەرپێچیکەرو فێربوونی کارو پیشەو هتد.

میدیاکانیش بە تەلەفیزیۆنو ئینتەرنێتو ڕادیۆو گۆڤارو ڕۆژنامەکانیشەوە دەتوانن ڕۆڵی باش ببینن، هەندێکیشیان بەردەوام بینیویانە، لە هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵکداو ڕێنومایی کردنی گەنجان بۆ بەدەستکەوتنی زانیاری ڕاستو دروست. هەروەها نواندنو زنجیرە تەمسیلیو کۆمیدییەکانیش دەتوانن ڕۆڵە خراپو باشەکان بەئاراستەی ڕاستیو کێشەکانی ئەم سەردەمەدا ببەنو بێگومانم کە ئەو هۆکارانەی ڕاگەیاندنو میدیا لە کوردستاندا کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆو دیاریان هەیە لەسەر خەڵك.

شتێکی بەڵگە نەویستە کە گەنجانی ئەمڕۆ ئۆقیانوسێکی فراوانو بێبنی زانیارییان لەبەردەستدایە بەڵام خۆ ئەو زانیاریانە هەمووی باش نینو ئەو ئۆقیانوسە پێویستی بە فێربوونی مەلە هەیە. ئەم مەسەلەیە سەبارەت بە سەتەلایتو ئینتەرنێت زیاتر گرنگی هەیە. لەوانەیە 50 ساڵ لەمەوبەر هەرشتێك چاپکراو بووبێت یان لە ڕادیۆیەکەوە پەخشکرابێت خەڵکی بە سەنەدی ڕەسمی وەریانگرتبێت. بەڵام لە ئەمڕۆی هەڕاجی تەکنۆلۆژیاو

ئەلەکترۆنیاتدا ئەو مەسەلەیە شێوازێکی دیکەی هەیەو بۆ ئەوەی لەنێو زانیاری هەڵەو فریودەرانەدا نەخنکێییت پێویستت بە ڕێنومایی و ماندوبوون هەیەو کات تادەڕوات تەنگەبەرتر دەبێتەوە.

ئەمڕۆ شتێکی گێلانەیە گەریتەوێت منداڵ و گەنجەکان بە ترس و تۆقاندن لەو مەسەلانە دوربخەیتەوە. ئەوان پێویستیان بەوە هەیە کە ڕووی ڕاستی مەسەلەکانیان بۆ ڕوونبکەیتەوە بەبێ کەم و زیاد کاریگەرییە نزیک خایەنە خۆشەکانی بناسن هەروەك لەمەترسی کاریگەرییە درێژخایەنە خراپ و داڕوخێنەرەکانی هۆشدارییان دەدەیتێ.

پێدەچێت لە کوردستان پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکانیش بتوانن ڕۆڵی خۆیان ببینن و کۆمەڵانی خەڵك و لانی کەم دۆستان و لایەنگرانی خۆیان بەئاراستەی پێویستدا بەرن. بێگومان ڕۆڵی مزگەوت و پێشەوا ئاینییەکانیش نابێت فەرامۆش بکرێت کە لە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانەدا ئاین ڕۆڵی خۆی هەیە لە ئاراستەکردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵکدا.

بوارێکی دیکەی گرنگ بواری وەرزشە. گەشەپێدان بە وەرزش و سەرقاڵبوونی گەنجان بە چالاکییە وەرزشییەکانەوە زەمینەیەکی باشە بۆ دوورکەوتنەوە لە تێوەگلان لە دەرمان و مادە هۆشبەرەکانەوەو خۆی لەخۆیدا نیشانەی تەندروستی باش و هەستکردنە بەوەی کە بەشێکی چالاکی کۆمەڵگان. شایانی باسە چالاکییە وەرزشییەکان لەلای هەندێك کەس هاندەریشن بۆ بەکارهێنانی هەندێك جۆری دەرمان و مادە هۆشبەرەکان. ئەو کەسانە بەبەکارهێنانی ئەو دەرمانانە هەست بە هەندێك نیشانەی کورتخایەن و چالاکی کاتیی دەکەن کە لەڕاستیدا زیانیان زۆر زۆرەو لەگەڵ

ڕەوشتو ئەدگاری کەسانی وەرزشەواندا نایەنەوە. زۆر لەو دەرمانانە کە پێدەچێت بۆ مەبەستی بەهێزکردنی ماسولکە یان خێرابوونو چالاکبوون بەکاربهێنرێن لەشوێنی خۆیاندا باسکراون.

ڕەنگە کەسێك بڵێت: جا پەروەردە چ کاریگەرییەکی هەیە لەسەر کەسێك کە هۆشی بەخۆی نییەو تا بینەقاقای تێوەگلاوە لەو مادانەوە؟ بەرلەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە کە دەمانبات بەرەو خاڵی سێیەکی بەرنگاربوونەوە کە ئەویش چارەسەرە، ئەم نمونەیە باسدەکەین:

"تاینا کچێکی ئینگلیزەو هەر لە تەمەنی بیست ساڵییەوە دەستی دایە بەکارهێنانی هیرۆینو بۆ ماوەی دەساڵی ڕەبەق بەکاریدەهێنا. ماوەی چوارساڵیان ئەوە هەر بەتەواوی ئالودە بووبوو زۆر بە توندی بەکاریدەهێنا. ئەو پارەکەی بە سواڵکردنو دزی لە کۆگاو دوکانەکانو تەزویرکردنی بەڵگەنامەکان بەدەستدەهێنا. لەکاتی هەرە خراپیدا ڕۆژانە پێویستی بە بڕی 160 پاوەند هەبوو بۆ ئەوەی بتوانێت خووەکەی پێ کپبکاتەوە.

دوای ماوەیەك تووشی خەمۆکی بوو، بۆ چارەسەری خەمۆکییەکەی پەنای بردە بەر پزیشك بەڵام خوی دەرمانەکەی بەبێ چارەسەر مایەوە. ئەو پێدەچێت ئەو گروپانەی بەدڵ نەبوبێت کە چارەسەریان کردووە یان ئەو دەرمانەی کە داویانەتێ وەك جێگرەوەیەك بۆ هیرۆین بەکەمی زانیوە. دوای ئەوە پەیوەندی کرد بە گروپێکەوە کە لەگەڵ ئەوەشدا دەیانزانی ئەو دەرمان بەکاردەهێنێت هەر قوبوڵیان بوو لەگەڵیان بێت. ئەوان ماوەیاندا بە تاینا کە بەڕاشکاوی باسی کێشەکانی بکاتو چەندەها بواری چارەسەریان خستەپێش چاوی. ئەو بەبەکارهێنانی چەند جێگرەوەیەك بۆ ماوەیەکی دیاریکراو توانی

بەسەر خووەکەیدا زاڵبێت. ئەو ئێستاکە لەگەڵ ڕێکخراوە نیشتمانییەکانی بەرگریکردن لە دەرماندا کاردەکاتو بەگوێرەی ئەزمونی خۆی ئامۆژگاریدەدات بە خەڵکانی دیکە بۆ ئەوەی زاڵبن بەسەر خووەکەیاندا".[19]

چارەسەرکردن خاڵی سێیەمو کۆتایی پرۆسەی بەرگرتنە لە دەرمانو مادە هۆشبەرەکان. چارەسەرکردن گەلێك بواری هەیەو لە وڵاتە لێك جیاوازەکاندا بۆچونی جودای لەسەرە.

لەهەندێك وولات چارەسەرکردن بودجەی گەورەو گرانی بۆ دادەنرێتو لەهەندێك وڵاتی دیکەشدا بە جۆرێکی دیکەیە. لە بەریتانیا ئامانجی ستراتیژی دەوڵەت ئەوەیە کە تاساڵی 2008 بتوانن هەموو ئەوانەی کە بەهۆی بەکارهێنانی دەرمانو مادە هۆشبەرەکانەوە تووشی لادانو تاوان دەبن بتوانن چارەسەریکرێن. لە ئەمریکاش تاوانباران ئەگەر تاوانەکەیان بەهۆی دەرمانەوە بێت ئەوا دەبرێنە دادگای دەرمانو بەرنامەی چارەسەرکردنیان بۆ دادەنرێت.

خاڵێکی دیکەی چارەسەرکردن لە بەریتانیا کەمکردنەوەی مەترسییە. ئەوان لەوباوەڕەدان کە خەڵکی خوگرتوو ئالودەبوو دەرمانو مادە هۆشبەرەکان هەر بەکاردەهێنن، بەڵام بۆ کەمکردنەوەی مەترسی تووشبوون بە نەخۆشییە زایەندییەکانی وەك HIV Aids و هیپەتایتس سرنجیان بە خێرایی بۆ دابین دەکەنو لەبەرانبەر گێڕانەوەی سرنجە بەکارهاتووەکاندا وەریدەگرن. ئەم ڕێگایە زۆر بۆچونی لێکجیاوازی لەسەرەو هەندێك لەوباوەڕەدان کە ئەوە

[19] Home Office. Drug Strategy Progress Report 2004. Tackling Drugs. Changing Lives: keeping Communities Safe from Drugs. P. 6

هاندانی زیاترە بۆ بەکارهێنانی دەرمانو کارئاسانییە بۆیان، بەڵام کەسانێکی دیکەش دەڵێن کەمکردنەوەی مەترسی باشترە لە مەترسی گەورەتر.

لە بەریتانیا ئالودەبوان چەندەها ڕێگاو بواریان لەبەردەمدایە بۆ وەرگرتنی چارەسەری وەك دەرمانی هێواشتری جێگرەوە بەتایبەتی بۆ ڕاهێنانەوەی ئەوانەی کە ئالودەبوون بە دەرما نی پۆلی A ەوە، هەروەها بە چونە نێو گروپی هاودەردو بیروڕائاڵوگۆڕکردنو دووبارەڕاهێنانەوە بۆ نێو کۆمەڵگاو پێشکەش کردنی کۆمەکی تایبەت بەو کەسانەو کەسوکارو خێزانەکانیان لەپێناوی زاڵبوون بەسەر خووەکەیاندا.

ڕێگای دووبارەڕاهێنانەوە ڕێگایەکی کاریگەرە بۆ ئەوانەی کە واهەست دەکەن لە کۆمەڵگا تەریککەوتونو کەوتونەتە پەراوێزەوە.

ئەو جۆرە کەسانە کە بەزۆری بەهۆی تووشبوون بە نەخۆشییە دەروونییەکان یان بەکارهێنانی دەرمانو مادە هۆشبەرەکان یاخود هەردووکیان پێکەوە تووشی ئەو بارە ناهەموارە دەبن، پێویستیان بە پشتگیریو کۆمەکی خێزانو دۆستانو هاوڕێیانو کۆمەڵگاو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان هەیەو پێویستە دووبارە سەرلەنوێ ڕابهێنرێنەوە بۆ گەڕانەوە بۆ نێو ژیانی کۆمەڵگا. چەندەها کەس هەیە دوای ئالودەبوون بە دەرمانەوەو تێوەگلان لە تاوانەوەو بەسەربردنی ماوەیەکی زۆر لە زینداندا وەرگرتنی چارەسەر وا هەست دەکەن ژیانێکی زۆریان فەوتاوەو تەمەنیان لەگەڵ ئەو زانینو زانیاریانەدا ناگونجێت کە هەیانە. ئەوانە لە وڵاتانی خۆرئاوادا کۆمەکی باشیان پێدەکرێتو خەڵکانی تایبەت کە بەزۆری خۆبەخشن هاوکارییان دەکەن تا وەك منداڵ سەرلەنوێ ڕایاندەهێننەوەو سەرلەنوێ فێردەبنەوە.

بەشێوەیەکی گشتی ئالودەبوان پێویستیان بە چارەسەرو کۆمەکەو ئەو ئەرکەش ئەرکی کۆمەڵگاو دەوڵەتە لەپێناوی کەمکردنەوەی ئەو مەترسیانەدا کە بەهۆیٔ خراپبەکارهێنانی دەرمانەوە ڕوودەدەن. لەلایەکی دیکەشەوە ئەوانە، بەتایبەتی گەنجان، ئەندامانی کۆمەڵگان و پێویستیان بە ڕاستکردنەوەو ڕێنومایی هەیە نەک تەنها سزاو زیندان. ئەمڕۆ زانستی کریمینۆلۆجی لەو باوەڕەدایە کە باشترین سزا ئەو سزایەیە کە ئەو کەسە لەنێو کۆمەڵگادا بمێنێتەوەو ئازادییەکانی سنورداربکرێن و ولیلێبکرێت کاربکات، بەلام بەشێوازێکی سەردەمیانەو بەپێی ڕێوشوێنی کۆمەڵگایەکی مەدەنی دیموکراتی نەک وەک کاری قورسی بەزۆری نێو زیندانەکان. بەپێی ئەم ڕێبازە ئەو کەسە پێویستە خۆی ڕازیبێت بەو کارەو پێدەچێت بواری پێبدرێت لەنێو چەند جۆرە کارێکدا هەڵیبژێرێت. پێویستە کارەکە لەگەڵ تواناو تایبەتمەندییەکانیدا بگونجێت و یارمەتیدەربێت بۆ دووبارەڕاهێنانەوەی بۆ نێو کۆمەڵگا وەک هاولاتییەکی بەسود.

## مرۆڤ وێڵبوون بەدوای بەختەوەریدا

مرۆڤ لەسەردەمە هەرە کۆنەکانەوە بەدوای بەختەوەریدا وێڵبووە. پاشاکان هەرەم و کۆشکەکانیان بە ئومێدی نەمری و بەختەوەرییەکی هەتا هەتایی دروستکردووە. مرۆڤ تا ئێستا نەیتوانیوە پێناسەیەکی دەقاودەق بکات بۆ بەختەوەری. پێدەچێت هەزار دەوڵەمەند بە بەختەوەر بزانێت چونکە بە پارەکەی دەتوانێت هەموو شتێك بکڕێت و لەوانەشە زۆر دەوڵەمەند هەژار بەبەختەوەر بزانێت چونکە سەری سوکە. خەڵکی خۆرهەلات لەوباوەڕەدان

خۆرئاواییەکان زۆر بەختەوەرن چونکە پێشکەوتونو تەکنۆلۆژیا لەلای ئەوان گەیشتوەتە لوتکە، بەڵام پێدەچێت زۆر لەخەڵکی خۆرئاواش ژیانێکی سادەو ساکاری خۆرهەڵاتی بەبەختەوەرتر بزانن لە ژیانی خۆیان" بەرزی رادەی خۆکوشتنو کێشە دەروونییەکان لە کۆمەڵگا خۆرئاواییەکاندا ئەو راستییە دەسەلمێنێت. بەدەر لە دابین بوونی لانی کەمی پێویستییەکانی ژیان کە بۆ هەر کەسێك پێویستەو لەبنەڕەتدا مافی سروشتی هەموو مرۆڤێکیشە کە لانی کەمی پێویستییە بنچینەییەکانی بۆ دابینبکرێت، لەراستیدا پێدەچێت بەختەوەر ئەو کەسەبێت کە خۆی بەبەختەوەر دەزانێتو باوەڕو متمانەی بەو بارە هەیە کە تێیدایەو پێوەرێك نییە کە رادەی بەختەوەری مرۆ بپێوێت بێجگە لە بۆچوونی خودی ئەو کەسە خۆی. مرۆڤی بەختەوەر کەسێك نییە کە خاوەنی تایبەتمەندیو سامانێکی ماددی یان مەعنەوەی دیاریکراوبێت بەڵکو مرۆڤێکە کە خاوەنی سامانێکی باشی کۆنترۆڵکردنە بەسەر هەستو نەستو ئارەزووەکانیدا.

ئاشکرایە هەموو جۆرەکانی دەرمانو مادە هۆشبەرەکان لەپێناوی بەختەوەریدا تاقیکراونەتەوەو هەتا ئێستاش ئەوانەی کە خوویان پێوەدەگرن یان ئالودەدەبن لەسەرەتادا بەمەبەستی بەختەوەریو بیرچونەوە یان راکردن لە کێشەو گرفتەکانیان دەستیان دەدەنێ، ئەگەرچی دواتر بۆیان روونده‌بێتەوە کە وەدوای سەرئاویلکە (سەراب) کەوتون. توێژینەوەکان دەریانخستووە کە هەموو ئەو کەسانەی دووچاری ئالودەگی دەبن لە یەکێك لە قۆناغەکانی ژیانیاندا هەست بە پەشێمانی دەکەنو زۆر کەسیش کەڵك لەو پەشیمانییە وەردەگرێت. من لە کوردستان

پیرەمێردی 70 ساڵەم بینیوە دەستی لە جگەرەکێشان هەڵگرتوەو جارێکی دیکە تۆخنی نەکەوتۆتەوە بەبێ هیچ چارەسەرو دەرمانێکی نوژداری جێگرەوە.

ڕژانی مادەی Dopamine لەمێشکدا دەبێتە هۆی هەستکردن بەخۆشی بەڵام تا چ ڕادەیەك؟ پێدەچێت هەرمرۆڤە ڕادەیەکی دیاریکراوی هەبێت لەو مادەیە یان ئاستێکی دیاریکراوی هەبێت بۆ ڕژاندنی لەکاتی لەبارداو پێویستی بە هەلومەرجی تایبەت هەبێت، فشارخستنەسەر مێشك بۆ ڕژاندنی بڕێکی هەرچی زیاتر لەو مادەیە بەپێچەوانەی هەلومەرجی تایبەتی خۆیەوە وایلێبکات دواتر نرخی ئەوەی پێشو بداتەوە. ئەوەی پشتگیری ئەو بۆ چونە دەکات هەستکردن بە ماندویی و سەریەشەو پەستی و کێشەی دەرونییە دوای بەکارهێنانی ئەو مادانە. کەسانێك کە ئەلکهول دەخۆنەوە دوای هەست بە سەریەشەو ئەو جۆرە پەستییە دەکەن کە بە بەردانی دوای مەستی ناسراوە. ڕاستە بەشی زۆری سەریەشەکە لەئەنجامی کەمبوونەوەی شلەمەنیەوەیە لەلەشدا بەهۆی میزکرنی ناسروشتییەوە، بەڵام پێدەچێت بەشێکی دیکەشی بەهۆی سڕکردنی ناوەندی پەیوەندی ناردن و وەرگرتنی پەیامەکانەوە بێت لەنێو مێشکدا کە دەبێتە هۆی ئەوەی جەستە نەتوانێت بەڕێکوپێکی وەڵام بە مەترسی و پێویستییەکان بداتەوە. مادە هێمنکەرەوەکان لێدانی دڵ کەم دەکەنەوەو هەناسەدان هێواش دەکەنەوە. ئەو پەیامانەی کە دەچن بۆ ماسولکەکان و بەتایبەتی چوارپەل زۆر هێواش و لەرزۆکن و دەست و قاچ بەڕێکوپێکی ناجوڵێن. بەوجۆرە جەستە ناتوانێت هەست بە مەترسی بکات یان کاردانەوەی خێرای هەبێت بۆ مەترسی.

مادە وورياكەرەوەكان دەبنەهۆی پێكهێنانی پەيامی هەڵە لەمێشكدا كە وا لە جەستە دەگەيەنێت لەژێر فشاردايەو ئەويش بە ناردنی خوێنی زياتر بۆپێستو زيادكرنی لێدانی دڵو زيادڕژاندنی شەكر لەلايەن جگەرەوە پەرچەكرداری خۆی پيادەدەكات. لەئەنجامدا ئەو كەسە لەپەلوپۆ دەكەوێتو پرتاوی لەبەردەبڕێتو

ئەگەر جەستە كەوتە ژێر فشارێكی ڕاستەقينەوە ناتوانێت وەڵامدەرەوەبێت بەو فشارە.

ئەو وێنەیەی بەرانبەر ئەو پەیوەندییانەو گەلێك كاریگەری دیكەش ڕوووندەكاتەوە.

هەرچی مادە هەلوەسە هێنەرەكانيشە ئەوە كاريگەری سامناك لەسەر

DEPRESSANTS slow messages between the body and brain.
Signals from the eyes and other senses reach the brain slowly.
Heart rate drops, leaving the body with less energizing oxygen.
Breathing rate decreases; risk of lung infections rises.
Messages to muscles are slower; arms and legs can't move well.
RESULT: The body can't sense —or respond to— danger quickly.

STIMULANTS create fake messages in the brain, telling
the body is less able to cool itself. Overheating is a risk.
Heart rate speeds up. Blood vessels to the heart constrict.
The liver releases sugar into the blood, reducing
RESULT:

هەڵسوكەوتو هۆش‌و بیری ئەو كەسە جێدەهێڵن‌و مەترسی كاریگەرییەكانیان لەوانی دیكە كەمتر نین. بەم شێوەیە ڕووندەبێتەوە كە دەرمان‌و مادە هۆشبەرەكان هیچ بەختەوەرییەكی بەردەوام بەرهەم ناهێنن‌و ئەو خۆشییە كاتییەش كە مرۆڤ هەستی پێدەكات لەزۆرترین باردا دواتر نرخەكەی دەداتەوە. ئەوەندەی كە پەیوەندی بە ئالودەگییەكی تەواوەوە هەیە بەو مادانەوەو بەتایبەتی بە مادە هەرە بەهێزەكانەوە ئەوا نرخەكەی زۆر قورسە لەسەر تاكەكەس، خێزان‌و كۆمەڵگا.

## فەرهەنگۆك

Addiction: ئالودەگی، بریتییە لە ئالودەبوون و گرفتاربوون بەو مادانەوەو نەتوانینی هەڵکردن بەبێ دەرمان و مادە سڕکەرەکان و بوونیان بە کێشەی بنچینەیی و سەرەکی ژیان.

Dependent: خووگری، بریتییە لە خوگرتن و راهاتن لەگەڵ دەرمان یان خویەکی دیکەی سایکۆلۆژی.

Tolerance: راهاتنی لەش لەگەڵ ئەو مادانە و پێویست بوون بە زیادکردنی بڕی ئەو مادەیەی کە بەکاریدەهێنێت بەشێوەیەکی بەردەوام، بۆ ئەوەی کاریگەرییەکەی یەکەم جار بدەنەوە بەدەستەوە.

Withdrawal: کشانەوە یان پاشەکشە، ئەو هەستە کاتێک ڕوودەدات کە ئەو کەسە دەست لە بەکارهێنانی دەرمان و مادە سڕکەرەکان هەڵدەگرێت یان دەستی ناکەوێت و هەست بە بێتاقەتی و شێوانی باری جەستەیی و دەروونی دەکات و ئۆقرەی لێهەڵدەگیرێت.

# Bibliography

## سەرچاوەکان

A brief History of Coffee [online]
http://www.2basnob.com/coffee-history.html
Albert Hofmann. 'LSD: My problem child,' McGraw Hill 1980.
*Alcohol Health & Research World*, Vol. 14, No. 4, 1990.
*Alcohol Research & Health* 27(2):125–133, 2003.
All about Khat [online]
http://www.geocities.com/forceps1974/khat.html
Armitage, R., (1987) Let's Discuss Drinking. Hove: Wayland Publishers Ltd.

ASH -Action On Smoking and Health , Basic Facts One, January 2003.
Barber, J., G., (2002) Social Works With Addictions. 2nd ed. London: Palgrave.
BBC News [online] http://news.bbc.co.uk/1/hi/health/4348559.stm
Bean, P., (2004) Drugs and Crime. 2nd ed. Devon: Willan Publishing.
Brownlee, (2002) This is CANABIS. London: Sanctuary Publishing.
Christian Olive. Reuters, 3 January 2004. Bam, Iran. [online] http://opioids.com/opium/iran.html
Claire, A.,& Smith, H., (2003) Drug Culture: The Facts Behind the Headlines.
Connolly, S.,(2002) Need to Know Solvent Abuse. Oxford: Heinemann.
Cooney, J., G., (2002) Under the Weather: Coping with Alcohol Abuse and Alcoholoism. 2nd Ed. Dublin: Newleaf.
Corporate Strategy 2002-2005: More treatment, better treatment, fairer treatment.
Donnellan, C., (1999) Alcohol. Cambridge: Independence.
Donnellan, C., (2000) Drugs in Sport. Cambridge: Independence.
Donnellan, C., (2001) Drug misuse. Cambridge: Independence.
Delivering drug services to Black and minority ethnic communities. Home Office, United Kingdom.
*Dr Syed Rashid Ali* (Online) Drugs and Ahmadiyyah Movement. http://alhafeez.org/rashid/drugs.htm
Drug Awareness Studies and their Applications (NCFE Course). UK. 2003
Drug Scope (online) http://www.drugscope.org.uk/

Drug Intelligence Brief –Khat, June 2002- US Drug Enforcement Administration [online]
http://www.usdoj.gov/dea/pubs/intel/02032/02032p.html
Drugs Act 2005 [online] www.hmso.gov.uk/acts
Drugs Act 2005 C.17 [online]
http://www.legislation.hmso.gov.uk/acts/acts2005/20050017.htm
Ectaco Dictionaries. [online] Dictionaries for 45 Languages.
http://www.knowledgesource.blogspot.com/
European Monitoring Centre for Drugs and Drug Addiction-2003 Annual Report-Lisbon.
Foetal Alcohol Syndrome aware UK **http://www.fasaware.co.uk/#top**
Freud's Magical Drug [Online]
http://www.botgard.ucla.edu/html/botanytextbooks/economicbotany/Erythroxylum/
Hammersley, R., et al., (2002) Ecstasy: and the rise of the Chemical Generation.London: Routledge.
Heroin Addiction and Drug Policy: the British system, J. Strang and M. Gossop (eds), Oxford Univeristy Press, 1994.
History Net- The History of Tobacco part 1 (to 1676) [online]
http://www.historian.org/bysubject/tobacco1.htm
Holy Quran (online) 37/47 Alsafiyat
http://quran.muslimweb.com/sura.htm?aya=037
Home Office. Drug Strategy Progress Report 2004. Tackling Drugs. Changing Lives: keeping Communities Safe from Drugs.
Home Office Press Releases -CLASSIFICATION OF CANNABIS. Reference: 057/2005 - Date: 19 Mar 2005 00:01.
Home Office UK, (2004) Substance Misuse and the Workplace. A training pack.

IAS factsheet; Alcohol: Tax, Price and Public Health. [online] http://www.ias.org.uk/factsheets/tax-price.pdf
Imaging and diffusion tensor imaging to assess brain damage in alcoholics. *Alcohol Research & Health* 27(2):146–152, 2003.
International Narcotics Control Board. Vienna International Centre. 2004 [online]. http://www.incb.org/e/index.htm
Islam Online. What does Islam say about Drugs? http://www.islamonline.com/cgibin/news_service/spot_full_story.asp?service_id=749
June Russell's Health Facts. Alcohol- Kidney and Bladder. [online] http://www.jrussellshealth.com/alckid.html
K., James, (1998) Ketamine: Mtaprogramming From Within the Eye of the Storm. [online] http://www.erowid.org/chemicals/ketamine/references/other/1997_kent_resproject_1.shtml
Macpherson, G., MB, BS (2002) Black's Medical Dictionary. 40th edition, London: A&C Black Publishers Ltd.
Marsano, L.S. et al. Diagnosis and treatment of alcoholic liver disease and its complications. *Alcohol Research & Health* 27(3):247–256, 2003.
Mary Ann Emanuele,M.D., Frederick Wezeman, Ph.D., and Nicholas V. Emanuele, M.D. Women and Alcohol: An Update. Volume 26, Number 4, 2002.
Medical Research news- News Medical.net (2004) [online] http://www.news-medical.net/?id=861
Misuse and overuse of antibiotics: who is to blame? TWN Third World Network [online] http://www.twnside.org.sg/title/ong-cn.htm
Models of care for treatment of adult drug misusers. Home Office, United Kingdom.

National Criminal Intelligence Service, 2003. [online] http://www.ncis.co.uk/ukta/2003/threat03.asp
National Institute on Alcohol Abuse and Alcoholism. [Online] http://www.niaaa.nih.gov/
Newburn, T., & Shiner, M.,( 2001) Teenage Kicks? Young people and Alcohol: A review of the Literature. York: York Publishing Services Ltd.
NIDA,National Institute on Drug Abuse: The science of drug abuse and addiction. [Online] http://www.drugabuse.gov/
Nigel, S., Drugs: Cultures, Controls & Everyday Life.
Ohio State Highway Patrol [online] http://statepatrol.ohio.gov/media/2002/mr0201.html
Oscar-Berman, M. and Marinlovic, K. Alcoholism and the brain: An overview.
Psilocybe Magic Mushrooms and the law- legal issues. [online] http://www.magic-mushrooms.net/legal.html
Real news about drugs and your body [online] http://teacher.scholastic.com/scholasticnews/indepth/headsup/facts/index.asp?article=drug_inhalents
Rosenbloom, M., Sullivan, E.V., and Pfefferbaum, A. Using magnetic resonance.
Stop Drugs. Org- Tobacco [online] http://www.stopdrugs.org/tobacco.html
The Guinness Book of Records 1997.
The History of Tea (online) _http://www.2basnob.com/tea-history-timeline.html
Uddin, J., et al., (2001) Community Engagement Project. Department of Health.
UNODC 2004 United Nations Office on Drugs and Crime. [Online] http://www.unodc.org/unodc/index.html
UNODC-Iran Country Office [online] http://www.unodc.org/iran/index.html

US Drug Enforcement Administration DEA. Narco-Terrorism. [online]
http://www.usdoj.gov/dea/ongoing/narco-terrorism.html
VOA News, GENEVA, Switzerland, Feb. 27, 2005
Warren, K.R., and Foudin, L.L. Alcohol-related birth defects—The past, present, and future. *Alcohol Research & Health* 25(3):153–158, 2001.
Westcott, P.,(2000) Why do people take drugs? Lewes: White-Thomson Publishing Ltd.
WHO-(2004) Global Status Report: Alcohol Policy. Geneva. [online]
http://www.who.int/substance_abuse/publications/en/Alcohol%20Policy%20Report.pdf.
Wikipedia encyclopaedia (2005) [Online] http://en.wikipedia.org/wiki/Alcohol
World Drug report of UNODC [online]
http://www.unodc.org/unodc/index.html
World's First Anti-Tobacco Treaty Goes into Force.
World Health Organization Geneva (1992): Women and Tobacco. London: Franklin Watts.
World Star free dictionaries [online]
http://www.stars21.com/index.html?pname=african&aname=farsi&fname=dict_fa&word=

## پاشکۆی 1

**دابەشبوونی جوگرافی ناوچەکانی دەوەنی کۆکاو لووەکی ئەفیون:**

## MOST Newsletter No. 9 - October 1998

http://www.unesco.org/most/news9mp2.htm




*World Cultivation of Coca Shrub and Poppy Plant*

## پاشکۆی 2

**From:** Sharon McEachen [SharonM@drugscope.org.uk]
**Sent:** 02 March 2005 12:09
**To:** 'zhiar@ukonline.co.uk'
**Subject:** RE: Drugs and law

Dear Ata

Thank you for your email. Can you tell me where on the DS website you saw the incorrect information, it would help me in my trawl of all the information there. Supplying class C drugs is now 14 yrs - up from 5. Law changed as result of reclassification of cannabis to deter dealing.

kind regards

Sharon McEachen
Information Officer
Information and Library Services
Drugscope
32-36 Loman Street

London
SE1 0EE
tel: 0207 922 8620
email: sharonm@drugscope.org.uk

-----Original Message-----
**From:** Ata Arif [mailto:zhiar@ukonline.co.uk]
**Sent:** 02 March 2005 09:09
**To:** info@drugscope.org.uk
**Subject:** Drugs and law

Dear Drug Scope

At your website under law it comes that class C drugs have 14 years imprisonment for supplying but in other places it is 5 years for the same purpose. Can you please make me sure which one is the most updated one?

Best regards

Ata

--
No virus found in this outgoing message.
Checked by AVG Anti-Virus.
Version: 7.0.300 / Virus Database: 266.5.2 - Release Date: 28/02/2005

--
No virus found in this incoming message.
Checked by AVG Anti-Virus.
Version: 7.0.300 / Virus Database: 266.5.7 - Release Date: 01/03/2005

## دەربارەی نوسەر:

- ناوی عەتای مەلا کەریمە
- لەساڵی 1964دا لە گوندی پارەزانی سەر بە ناوچەی شارباژێر لەدایك بووە.
- لە ساڵی 1988دا کۆلێژی ئاداب بەشی زمانی ئینگلیزی لە زانکۆی بەغدا تەواوکردووە.
- ئەندامی کۆمەڵەی وەرگێرانی عێراقییە
- ئەندامی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بووەو لە ساڵی 1982 دا لەلایەن دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی بەعسەوە دەستگیرکراوەو دوای ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر لە لێبوردنێکی گشتیدا ئازاد بووە
- لەساڵی 2002دا گەیشتووەتە بەریتانیاو لەوێش سەرقاڵی خوێندنی کریمینۆلۆجییە لە پەیمانگای لانکەشێری خۆرهەڵات بۆ خوێندنی باڵا
- بێجگە لە بابەتی سەرەکی خوێندنەکەی ئەم بروانامانەشی وەرگرتووە:

OCA Criminology
OCB Law
OCB Psychology
OCR-RSA- Computer
NCFE in Drug Awareness Studies and Their Applications
NCFE Computer Practioners

- لە گەلێك گۆڤارو رۆژنامەدا بابەتی وەرگێڕاو، ئامادەکراو یان نوسراوی خۆی بڵاوکردۆتەوە
- کتێبی تیرۆریزم: چونە نێو ناخی دیاردەیەکی جیهانییەوەی وەرگێڕاوە بۆ کوردی
- لە بەریتانیا لەگەلێك چالاکی رۆشنبیری و کولتوری و کۆمەلایەتی و تەندروستیدا بەشداری کردووە و چەندەها جار لە رادیۆی BBC ناوچەی لانکەشێر و رۆژنامەو کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانی ناوچەکەیدا چاوپێکەوتنی لەگەڵدا سازکراوە
- ئەندامی خۆبەخشی کۆمەڵەی کۆمەکی قوربانیانی تاوانە Victim Support
- ئەندامی رێکخراوی کەمینە نەتەوەییەکانی بەریتانیایە BEM
- ئەندامی کۆمەڵەی سەلامەتی کۆمەڵگایە Community Safety